## ( بەش یکــەم )

# هەولیر لە گەل کاروانەی فەلك

چەند جار لە مەوبەر لە نامەوە پرتوك ونوسراوی تایبەتی ومجاری تر لە هەندی وتار پەلاماری باس وەهەوالی کونی هـــەولیرم داوە لە ســـالانی رابوردو ، سەرو چاوەی زانتەکانم لە گەلی کات یاد وبیرو باوری خوم بووە ـــ چیم دیووە ـــ وە بیستوە وە وە خوینندووە دەرباری ئەم شـارە مەزنـــە وەولاتەکەی هەر جاریك لاپەرەیکی تازە لە کوشەیەکی ئەم باسە دواوەم پاش لی کوینەوەیکی تەواو ـــ وە هەردەم وەهەر کەرەتیك وام دیوە کەباس لـەم شارە وە رابوردەی لەتوانا نیە کە تواو بیت ـــ وە هەر جاری ئەم باسە لقوە پوپی تازەی لی پیا بووە وەرواووەوە بوینە شایانی وەتاریکی تازە .

وئەم نوسراوە تازەم کە بە چەند بەش لەقەلم دراوە بەهیچ چوریك وە بەتایبەتی تی باس لەمیژووی شار وە کومەلایتی بەتواوی ناکات وە بوئـــەم باسە تەرخان نەکراوە تەنها بە پیوستم زانی لەم زنجیرە باســـە بـــە کورتی رابوردەی ئەم شـــارە وە ســـەر گزشـــتەی بو خوینندوارنی خوشـــە ویست روشنای بکەم بی‌گومان بونی شاری هەولیر ئەگەرینەوە پیش زاین بەشەش هەزار سال زیاتر ، وە لەو کاتەوە تا ایستە ئەم شارە هەر ئاومدان بووە وە پر لە ژیان بووە وەگەلی نوسەرانی خو ولاتی وە بیگانە لایان وا دەر کەوتووە

که‌ئه‌م شاره کونترین شاره له روی زه‌مینی که‌تا ئیسته پر له ژیان به‌ر ده‌وام ماوه ـ به‌لکو له روی زه‌مین زور شاری تر له هند وه چین وه جیگای تر وه‌له‌م شاره‌ش کونتر بووه به‌لام هیچ شاریك له‌م شاره کونانه نه‌ماوه وه زور به‌یان له‌به‌ر کاره‌ساتیك روخاوون ئه‌و به جوریکی تر ویرانه بوینه وه‌ك گورانی ئاو هه‌وا ئه‌و به لافاو ویا بو مه‌له‌رزه وهه‌ندی شاری تر به بونه‌ی شه‌ر و شور و چه‌نگ دانشتوانی کوچیان کردوه •

ئه‌ما شاری هه‌ولیر وه قه‌لابه‌رزه‌که‌ی دانشتوانی به رامبه‌ر به هه‌مو کاره‌ساتیك خویان گرتووه به رامبه‌ربه په‌لاماری دوژمن ئه‌م شاره پاریز کراوه • وه ژیانی تیا هه‌ر ماوه وه له گه‌ل کاروانه‌ی فه‌لك کارو باری هه‌ل سوراوه وه ژیان وه‌کومه‌لایتی تیا به‌ر ده‌وام بووه وبورژاوه وه‌ئه‌م ناوچه‌یه له میژووی کون چاوگه‌یکی گرنگی بلاوکردنه‌وه‌ی زانستی کون بووه وه ئه‌ستوندیکی مه‌زن بووه بوپیش که‌وتن له‌سه‌ر زه‌مین • وئه‌م پرتوکه هه‌روه‌ك وتمان که‌زنجیریکه به‌شه له هه‌والی کونی هه‌ولیر باس ئه‌که‌ین •

وه له‌م زنجیره تازه‌یه گه‌لی شت له نوسراوانی کونمان که به عربی ویا کوردی بلاوکراوه‌ته‌وه یاس نه‌کراوه •

**١ ـ ناوی شار :**

به زبانی کوردی به هه‌ولیر ناو براوه وه ناوی کونی له میژوو به اربا ایلو ناو براوه وه‌گویا پیش پیا بونی ئاینی ئیسلام مبارك وپیشی زاینی مسیح ئه‌لین ئه‌م شاره کعبه‌یکی ئاینکی کون بووه له هه‌مو لایك گه‌لی کورد هاتوینه زیارتی وه‌به جیگای عشتاریش ماوه‌یك ناو داربووه وه ئیسته به اربیل ـ وه هه‌ولیریش ناو ئه‌بری وه‌نوسه‌رانی کون به چه‌ند ناو ناویان بردوه

وەك ــ اربا ايلو ــ اربيره ــ اربل ــ ارويل هــەر چەند ليكى ئەدەمەوە بــە تەواوى نازانيرى ناوى هەولير لە چى شتى وەرگيراوە وە بوچ لەكونەوە تــا ئيستە هەولير وە اربيل هەردو ناو لەيك كات هەردەم بەكار هينراووە .

گەلى نوسەر بيرو باوريان هەيە دەربارەى ناوى اربيل بەلام زور كــەم كەس دەربارەى ناوى هەولير لى‌كولينەوەى كردوە بە پيويست نەزانرا كــە فەرمودەى ئەم نوسەرانە بگيرينەوە چونكى دەربــارەى ناوى هەولير بــە تەواوى هيچ شتيك ليمان روشنا نابى‌تەوە .

٢ ــ ئەم شارە :

لە كونەوە دوپارچە بووە ــ پارچەى يكەمى قەلاى هەوليرە كە س(٣) گەرەك بووە ــ سەرا ــ توپخانە ــ تەكيە ــ وبەش دوهەمى شار ئەى خوارووى قەلا بە كورتەك ناوبراوە وئەم پارچەيە چوار گەرك بووە لە ســالانى ١٩٣١ بەرەو پيش خانقا وەسعدوناوا ــ تعجيل ــ جولەكان وەگەركى عەرب .

وئەم شارە لەكاتى ئاسايش بە دريژى ميژوو گەورە بوتــەوە وەگەش بو تەوە وە لە كاتى ئاشوبى شار گرژ بوتيە وە وەژيان رولە سەختى بووە .

وەلەهەر كاتى شار دانشتوانى زور بوبنە خوارووى قەلا خــانو بــەرەى تازەى تيا كراوە چونكى ئەندازەى قەلا كەم وەزيادى نەبووە بەلام كورتەك كە شار لە بورژان بووە گەرەكى تازەى تيــا دورست كراوەوە شــار پەرەى سەندوە وبالى كيشاوە وە وردە وردە ئەندازەى گەورە وە زل بووە .

هيچ كەسس لە توانای نيە كە بزانى ئەم شارە لەچى كاتى دورســت كراوە وەئەم شتەيى كە ئەتوانم بەبيرو باورى خوم پەسەندى بكەم تەنهــا

ئەتوانم بلیم بونی قەلا وپیا بونی ئاوەدانی وەدورست کردنی خانو بەرە لە قەلات پیش ئاوەدانی کورتەکە وئەگەر کەس بپرسسی ئەم قەلایە شوینەکەی هەروا بەرزو پان‌بووە وەئەم گردە دەست کردە وەیا هەر بووە بەپی باوری خوم‌ئەم شوینە گردیکی لی بووە بەلام بەرابوردەی سالها ئەم گردە وردە وردە ئەندازەی پان وبەرز بویتەوە •

٣ ــ وەهە تا ئیستە بەپی زانستس بەجی ماوەی کون ( اثار ) لی‌کوینە هیچ شوینکی قەلات نەکراوە وەهەل نەکەندراوە تازانیاری بەچی ماوەی کون ومیژوو نوسەر کەهەندی شتیان بە چەنگ بکەوی بوئەوەی بزانری کە قەلا چون پیا بووە وەچی لە ژیر دا پەیدا ئەبی •

وە ئەگەر لە مەودواوە هەندی شوینی لە لاین دەست گیری بەچی ماوەی‌کون هەل بقولری وهەل بکندری وائەزانین زور شتی کون پەیا ئەبی وە بە دەست ئەکەوی وە زانستیکی تازە وەگرنك بە چەنگ ئەکەوی بوروشنا کردنی میژووی کونی قەلات وە پیا بونی وە رابوردەی، وە قەلات لە کونەوە تا سالی ١٩٠٠م تەنها یك دەرگای بووە بەلام لە ژیر قەلا چەنـد ریگایك بو دەرەوە بووە •

بو ئاموشو لە کاتی کە قەلا وەشار لە لاین لە شکری دوژمن دەورەی گیرابی وە پەلامار درابی زور کەم روی داوە لە کاتی چەنگ وەشەرو شوری کون دانشتوانی قەلا بەچی بهیلن ، وەقەلا سەنگەریکی بە هیزبووە بو پاریزتنی شار وە بوشکەستی لەشکری دوژمن لەگەل ئەمشـدا لە گەلی خانوی قەلا لە ژیر خاکی ژوریك بیریك وەیا عەنباریکی دورست کراوی تیـا بووە بو شاردنەوەی شتی بە نرز ئەگەر شار لە ژیر ترسی داگیر کردن بووبی

ئەگەر هەندی مال بو ماوەیکی گورت بە جیان هیشتبیت •

وەك بیستوتە پیش سالی ١٩١٤ چاریکیان چەند بومەلەرزەی بە هیز لە هەولیر روی‌داوە وە بو پاریزتن لەم کارەساتە زور کەس لە دانشتوانی قـەلا بوماوەی مانگی وەیازیاتر کوچیان کردوە ومالیان گوزایتەوە بو چەند دیهاتی تزیکی شار وەگەلی مال لە خیوەت وەیا رەشمال ژیاوون •

وە لەقەلا (٣) بیری ئاو خواردنەوەی تیا بووە لە کاتی دەرگا بەستنی قەلا بە کار هاتووە ، وهەروها لەقەلا چەند دوکانیك وەیك قاوە خانەی تیا بووە •

وە ئەم قەلایە جیگای پاریزتنی دانشتوانی شـار بووە وچوار دەوری گەرکەکانی خواروی خەندەقیکی قول وەپانی تیا بووە لەگەل شورەیکی بەرز وە پان بە بونەی قەلا وە خەندەقەکە وشورەکە ئەم شارە لە دوژمن پاریـز کراوە •

**٤ ـ ئەندازەی ولاتی هەولیر :**

لە هەندی چەرخی میژوو ئەم ولاتە سنوری زور جیگای گرتووە و لـە هەندی کاتدا ئەم سنورە زور تەسك بووە •

سنوری ولاتی هەولیر بەپی توپوغرافیەی کون لای خوارەوەی ئەکەویتە بەینی هەردو زی ئەم زی گەورەوە وە زی بچوك بەپی ئەم تخوبە لە دوکانەوە تارانیە ئەگریتەوە وەلە لای زی گەورە ئەم سنورە ئەروات تاسنوری ئامیدی وە ئاکری ئەگریتە وە ، بیبچ ئەداتە وە تاسنوری موصل ئەی بودامەنی خازر •

وەلای تری سنوری تورکیایە تا کانی‌رەش وە لەس کوچکەی کـانی رەش سنور لە گەل کوردستان ایران دەست پی ئەکات تا حاجی ئومران رو

بەرو بو سیدەکان تا ئەگریتەوە سەر کانی‌رەش •

بەپی ئەم نقشەیە توپوغرافی ولاتی‌هەولیر چوار چوبەکەی قضـــای مخمور وەشقلاوە وە رانیە رواندوز (صدیق) وە زیبار تا ئاکری ئەگریتەوە•

وە لە کاتی عثمانیەکان هەولیر قائمقام نشین بووە تەنها ناوچەی شقلاوە ومخمور پەیوندی بەم شارە هەبووە ئەی لەکاتی باس کراوە سـنوری بەینی دوزی تا دوای چیــای سەفینی‌بووە گــەلی نوسەران ئــەلین هەولیر پیش پیدابونی زەردەشت زیارت گاهی هەمو کوردســـتان بووە وەهــــەندی لەنوسەران ئەلین ئەم شارە کعبەیکی ئاینکی کونی خوا پەرستن بووە وپاش پیا بونی زەردشت گەلیك لە دانشتوانی شاروەوەلا تەکە بوینە زەردشتی وە باش پیابونی ئاینی حضرتی عیسی زربەی گەل هاتوینە سەر ئەم ئاینە،پاش پیا بونی ئاینی ئیسلام مبارك لە سالی ١٦هـ بەدواوە گەلی ئەم ولاتە هاتوینە سەر ئاینی ئیسلام زور کەم کەس لە هەندی جیگا لە ســەر ئاینی حضرتی عیسی ماونەوە •

وە بە پیا بونی ئاینی ئیسلام زردەشـــتی بە تەواوی لە ولاتی هەولیر دوای پی هاتووە •

**٥ ـ هەروەك وتمان ئەم پرتوکە**

دەربارەی میژوی هەولیر نیە بەلام ئاوینەکە بو باس کونی هەولیر لەگەل ئەمەشدا بەشیکی ئەم نوسراوە تەرخان کراوە بو کورتە نوسینك لە نوسینی چەندنوسەریك کەباسی ئەم شارە ئەکەن •

**٦ ـ ئەم نوسراوە چەند بەشی**

لە کومەلایتی کونی هەولیر باس ئاکات ، چەند لاپەرەی تری دەرباری

هەل‌کەوتنی ئەم شارە وە دیمەنی کونی وەشیوی ژیانی وە رابوردەی ئەکات•

۷ ــ زورشت پی ویستە ئەگەر

لە هەولیر باس کرا بە تایبـەتی باس بکری لـە قـەلاتی هـەولیر ــ کاریزەکانی هەولیرــ چەند لاپەریك دەربارەی کورتە میژوی کونی وە پیاوی ناوداری وەزور شتی تر وەك هاوینە ئاواری وە بەچی ماوەی کون ( اثـار ) لەگەل ئەمشدا لەم نوسراوە ئەم شتانە باس نەکرا چونکی لە نوسراوی چـاپ کراوی پیشومان کە بەعربی نوسراوە و لەژیر ناوی ( تراث اربیل التاریخی ) ئەم شتانە باس کراوە بو ئەوەی دوبارە نەبیتەوە هەرشتی لە پرتوکی ناوبراو نوسرابی لیرە دوبارە نەکراتیەوە •

۸ ــ ئەم نامەیە کە بە ناوی هەولیر لە گەل کاروەنەی فەلك کـە چـەند بەشیکە یك دوای یك سەر گزەشتەی وەرا بوردەی ودیمـەنی کونی هەولیر پیش گورانی بەر چاو ئەخاتەوە وەك ئاوینەیك بو گەنجی ئەم ولاتە ، پـاش سالەها وە سالها وا ئەزانم ئەم نوسراوەش لە دەفتری میژوو ئەنوسری •

* * *

# (بــەش دوهــەم)

## دیمەنی کونی هەولیر وەکومەلایتی

زور گرنکی ئەزانم کەباس دیمەنی هەولیر پیش ٦٠ سال یان لە ١٩٢٦ بیری خەلك بخەمەوە چونکی ئەتوانم بلیم هەتا ســالی ١٩٣٥ هەولیــر زور نەگورابو وزور شــیوەی کونی تیا مابو ، لە سالی ١٩٢٦ بەرو دوا هــەولیر وردە وردە دەستی بە گورین کرد لیرەدا بیرو باوری خوم کەلە سالی ١٩٣٠ هەولیرم چون دیوە باسی ئەکەم • ئەم شارە دانشتووانی زوریان لە قەلابون ، قەلا (٣) گەرکی تیــدابو کە بەنــاو گەرەکی توپخانە ــ ســەرا ــ تەکیە ناو ئەبران •

لە دەرگای قەلا سەرای کون بوو باش سالی ١٩٢٠ کراوتە بەندیخانــە وپاش سالی ١٩٣٦ کراوتە قوتابیخانە کچان •
وەلە دەرگای قەلا چەند دوکانیکی تیابو •

لەقەلاکە سەر ئەکەوتی گورە پانیك بو ئەوانەی بو قەلا ئەهاتن نــەختی رائەوەستان هەناسیکان ئەدا ئەنجا کە ئەچونە ناو دەرگا پیاو ریگای راستیان ئەگرد وە ریگەی‌تر بەدەستی چەپدا ژن هاتو چوی لی‌ئەکرد ، وە لــە لای چەپی پیچەی ئەوریگایە کاولی قوتابیخانەیکی کون بو کــە پیــان ئــەوت

قوتابیخانەی ملا رسول افندی ، وادەر ئەگەوی کە ئەم شوینە لە کونەوە بو قوتابیخانە تەرخان کرابو ئەلین زور علمای گەورە لەم شوینە فیری خویندنی بەرز بوینە •

لە قەلا تەنها لە یك مزگەوت نوێژی جمعە ئەکرا ئەوەش مزگەوتی بەریز ملا افندی بو کە لە کاتی ناوبراو یکە پیاوە گەورەی هەولیر بووە لەم مزگەوتە قوتابیخانەیەکی ئاینی ئیسلام بە ناوبانگی تیابووە کە زور خویندواری بەرز لەوە شوینە فیری زانستی بوینە و ملای گەورەی بەریز خوی ئاموژکاری روژی جمعەی ئەکرد هەروها خوی سەروکی مام وستایان ئەم قوتابیخاینە بو ، هەمو پیویستی مزگەوت وەملاکان وە قوتابیکان لە لاین خوی پارەی بو دائەنرا •

قەلا یك دەرگای بووە لە دەوری عثمانلی دەرگای دوهەمی بو کراوە وپاش سالی ١٩٢١ دەرگای سیەم بە ناوی احمدی دورست کراووە •

کولانەکانی قەلا وەك ئیستا نەبو هەردولای کولان وەك دیواریك بو کە ریگای رویشتن پیادە بو ، ناوندەکەی جوگلەی ئاوی پیس بووە وە ئاوی بارانیش تیا ئەچو، ئەم سەکویان بەخشتی سور دورست کرابون،جولەکەکان هەرچەند لە خوار قەلا دانشتبون بەلام لەقەلا کەنیشتەیەکان هەبو دوحەشەی بو هی دەرەوەیان دو وەیا سی مالی تیا جی نشین بو •

قەلا نزیکەی ٨٠٠ خانوی تیابووە ژمارەی نزیکەی نو هەزار کەس ئەبو •

لە قەلا چەند مزگەوتی تر هەبو وە چەند تکیەی شیخ ودرویش تیابووە

وك مزگەوتی مالی بی گەن وتیکەی شیخ شریف وە نزیکەی ۲۰ دیوانخانەی تیا بو کە شەو خەلکی تیاکو ئەبو لە هەریکیان چەند میوانیکی تیا ئەخەوت کە لە جیگای تر هاتون وە یا خەلکی گوندکانی هەولیر بوون •

لەوکاتە قەلا جی نشین هەمو پیاوە ناودران شار بون وهەمو دوەلەمندی شار کە خاون کشتوکال بون یا خاوەنی پارەی زور بون مالیان لە قەلا بو پاش سالی ۱۹۳۵ وردە وردە چەند خاون مالی قەلایی دەستیان بە خانو کردن کرد لە گەرەکەکانی خوارەوە •

شاری هەولیر لەو کاتەشدا بازاریکی زور گەورەی بو ــ وجگــە لــە مەدەها دوکان ــ حەوت قەیسری بنە مالی دەباغەکان تیابو لەگە سی قەیسری تر • وهەر کوشەی بازار بو فروشتنی ویا دورست کردنی بابەتیك بو ــ لــە لایك جیگای ئاسنغەر دوای وان تەنەکەچی وەســەراج ــ کورتان دروو ــ کارگەچی ــ سەبزە فروش ــ قصاب ــ بقال وە عطار کوتال فروش وەدلاك وزور شتی تر •

دانشتوانی هەولیر گشتی وەك ئیستا اســـلام شافعی منهب بوون • گەرەکیگی بچوك لە خوارەوە جولەکە بون کە گشتی ژماریان نزیکەی هەزار کەس ئەبوون لە سالی ۱۹۵۰ ــ ۱۹۵۱ هەمویان هەولیریان بەجی هیشت •

باسمان کرد کەئەم شارە بەشیکی قەلا بو ، بەش دوەم خوارەوەی قــەلا بو ئەم بەشە بە کورتەك ناو ئەبرا •

ژمارەی دانشتوانی شار لە سالی ۱۹۲۷ ئەوانەی ناونوس کران وەئەوانەی

له ناونوس خویان شارد بو گشتی تریکەی ٢٥ هەزار کەس ئەبون •

مسیحی هەمویان لەگوندی عەنکاوە دائەنشتن کە ایستە بوینە شاریکی بچکولە ، بە گەریکی هەولیر دائەنری ، ئەمانەش لەدانشتوانی زور کونی ئەم خاکەن ومناوەی چەند چەرخیك هەر بە برایتی لە گل دانشتوانی دیهاتی تـر وشارستانی هەولیری بەریوە چون • و لەو کاتەدا لە ناو شار تەنها دە داوزدە مال مسیحی زیاتر نەبوەوە لە پاش سالی ١٩٤٠ لە گەرگی عەرب کەنیشتەکیان دورست کردوە پاش ئەم سەرەتایە پی ویستە هەندی شتی کونی هەولیر بـە تایبەتی باس بکری •

**١ ـ قوتابیخانە : ـ**

لەم دوەرەدا لەمشارە تەنها یك قوتابیخانە هەبوە شوینەکەی ئیستا دوکانە لە سەر شقامی صلاح‌الدین بەرامبەر بە بازاری گەورە ، لە سالی ٩٢٥ـ٩٢٦ قوتابیخانەی تازە دورست کرا کە جیگاکەی ئیستا کراوە بە پاریزگای هەولیر وبیجگە ئەم قوتابیخانە لەو کاتەدا قوتابیخانەی یکی تر کراوتەوە لـە گەرکی تعجیل،وەپاش سالی ١٩٣٠ سیەم قوتابیخانە لە سەرشقامی مظفریە بەرامبەر بە قەلا کراوتەوە •

ئەما قوتابیخانەی کچان پاش سالی ١٩٣٦ لەقەلا دامەزراوە وبیجگە ئەمش لە زور مزگەوت قوتابیخانەی ئاینی بو وەك مزگەوتی قـەلا ـ ومـزگەوتی یگەن لەقەلا ـ ومزگەوتی بازار ومزگەوتی شیخ ابو بکر افندی •

**٢ ـ کونە مزگەوتانی هەولیر ـ**

مزگەوتی ملا افندی لە قەلا ـ مزگەوتی شیخ چولی ـ مزگەوتی خانقاـ مزگەوتی شیخ محی‌الدین و مزگەوتی بازار ـ مزگەوتی شیخ الله ـ مزگەوتی

شەش پەنجە لە ناو بازار وە چەند مزگەوتی تر ٠

وبیجگە مزگەوت تکیەکان کە شوێنی درویشی قادری ونقشبندی بون لە کەلیکیان نویژ کراوە وەك تەکیەی شیخ شریف لە قەلا وەتەکیەی شیخ تاج الدین ـ تکیەی شیخانی دارەخورما ـ تکیەی شیخ مصطفی ابو بکر افندی ـ وتکیەی خلیفە احمد ـ وتکیەی شیخ عارف وتکیەی شیخ سلیم ٠٠٠ )

٣ ـ نەخوش دوتەندروستی :

لە دەوری عثمانلی پاش سالی ١٩٠٨ لە لاین بلدیەی (شارستانی) هەولیر نەخوشخانەیك بچوك دامەزراوە ودکتوریکی زاناپان لە موصلەوە هیناوە وپاش کوتای شەری یکەمی سەرزەمین لە سالی ١٩١٩ دولت نەخوشخانەی دامەزراندووە پاش دامەزراندنی ملوکیتی عیراق ئەی ـ پاش سالی ١٩٢١ وردە وردە ئەم نەخوشخانە ریك خراوە بەلام هیچ کاتی هەتا سالی ١٩٤٠ لە دو دکتور زیاتری تیانە بووە وئەگەر زور کون باسی تەندروستی بکەین ئەبینن چەند بابەت دەرمانی خوبی بووەبو هەندی نەخوشی ـ وەك درمانی چاو کە ئەم دەرمانە لە توی تریش وشەب دورست ئەکرا بوچاوئیشە بەکار ئەهینرا ـ وەئەخرا ناو پارچە پەروکیکی خاوین وە لە ناو شیری دایکی کوریکی شەش مانگە ئەم دەرمانە ئەتاواوە انجا ئەخرا بە چاو ژنیکی چاو بە ایش وئەگەر پیاو بایە شیری دایکی کچیك پەیا ئەکرا بوئەوی دەرمانەکەی تیا ئەتاواوە ٠ بوسەرما وە تەنگە نەفەسی وە کوکە هەنگونیان گەرم ئەکرد ودارچین و بەهاراتیان تی ئەکرد پاش سارد بونەوەی روژی ٣ جار نەخوش بەکاری ئەهینا ٠

بو هەلامەت ــ گیایك لە دەشتی هەولیر لە بهار پیا ئەبیت بە حاجیلە ناو ئەبری ، لەموصل بە (بیبون) ناو ئەبری گولی حاجیلە وشك ئەکرا، ئەم گولە بە دوشیوە بو هەلامت وەکوکە وزگ ئیشە بەکار ئەهات پاش کولاندنی لەگل شکر ئاوی ئەخورایەوە وبوهەلامت جاربە جار نەخوش لوتی ئەدا بەر هەلمی. هەروها ، سوتەك لەگل شکر ئەکوترا وە وە لەناو شیر ئەکولا انجا نەخوش بە کاری ئەهینا .

ودەرمانیکی تر لە مازو شەب وەچەندشتی تر تیکل ئەکرا پاش کوتینکی وردە بو ئازاری دەم ، ددان بەکار ئەهات .

٤ ــ سرای دولت ــ

لە کاتی عشمانلی لە قەلا بووە وە لەدوا روژی ئەم دوەرە لە خوارەوە لە جیگای مدیریتی پولیسی محافظە ئیستا لەو شوینە قشلەیك بو لەشکر دوردست کرابو وەپاش ئەم دەورە جیگای لەشکر گوزراوە درەوەی شار ، وە ، ئەم شوینە بووە جیگای پاریزگەی هەولیر وپاش سالی (١٩٣٠)،(١٩٢٧) دەستگاهیکی تازە لەم شوینە بو سرا دورست کرا وپاش ماوەی چەند سال لەپشتی چەند ژوری تریش دورست کرا .

هەتا سالی ١٩٤٠ هەمو دائرەکان لەو جیگایە بون بیجگە قوتابیخانە ــ نەخوشخانە ــ بلدیە ( شارستانی ) پاشتر دائرەی تەجنید ــ ونفوس لە دەروەی سرایجیگایان بو پیا کرا .

٥ ــ جیگای زیارەت ــ

چەند شوینك لە ناو شار بەپیاو چاك دائەنران وجی نشینی شار جار بە جار زیارتی ئەم مەرقەدانەیان ئەکرد وئەم نەزارگاهە کونانە ئەمەن

ــ شیخی چولی ــ بابا حیدر امــام محمــد ــ سلطان مظفر الدین ــ عزیز پیغەمبەر ــ امامی باومرهیل کە بەیل امام ناو ئەبرا ــ وەستنی ئیمامی •

**٦ ــ پیش سالی ١٩٢٦ هیچ اوتیلیك لە هەولیر**

نەبووە ریبوار کاروانچی لە خان دائەبەزین وئەمانەی لە خان ئەهاتنــە خواروە زور کەم بون چونکی لە قەلا نزیکەی ٢٠دیوانخانە بووە وەلە کورتەك هەم دیسان نزیکەی ٢٠ دیوانخانە یا میوانخانەی تیا بو ئەم میوانانە هەندیکی لەلادیوە ئەهاتنی وهەندیکی تر لە شاریکی ترەوە گەلی لە مانە ناسیاوی ئەم خانە خویە ئەبوون ، باش سالی ١٩٢٦ دو اوتیلی پچوك پیابو کەیکیــان بە مگردیچ ناو ئەبرا دوهەم بە ناوی اوتیل ( فرح ) ناوبرا •

٧ ــ هەولیر لە کونەوە چەند حمامیکی تیابوە وك حمام قەلاتــوحمام علی اغاــوحمام گەورە ــ وحمام بچوك ــ وحمام مودە وکونترین قاوەخانەی هەولیر قهوە خانەی عبو بە وەدوهەم قاوەخانەی علی فلیح بووە ــ انجــا حاجی شکر ناو باش سالی ١٩٣٠ قاوەخانەکەی دامەزراندوە وقاوەخــانەی عزیز افندی جیگای خویندوارن بو وکتیبخانەی تیابووە •••

**وە یکەم چاپ لە لاین مام وستای گەورە سید حسن حزنی**

هینراوە بو هەولیر کە روژنامەی زاری کرمانجی پاشتر چەند گوڤاری پی چاپ کراوە •

**٧ ــ لە شاری هەولیر لە سالی ١٩٢٧ تەنها(٣) س**

شقام بووە شقامی مظفریەــصلاح‌الدین خانزاد وئەم س شەشقامانە بە خرە بەرد راخرابون پاشتر گوراوە چەشنی تازە • لە ناو شار هیچ پی‌ویستی

اوتومتیل نەبو چونکی شارە ئەندازەکەی زور کەم بو بە پی هاتو چو ئەکرا پاش سالی ۱۹٤۰ تا سالی ۱۹۵۰ چەند عارەبانیك پیا بو کە بە ولاغ کاریان ئەکرد وە لە سالی ۱۹۵۲ اوتومتیل وردە وردە لە ناو شار بە کار هات انجا لە سالی ۱۹۵۳ بەدواوە (ادارەی محلی) دەستی بەپاص کرین کرد کە لە ناو شار ئامو شوی پی بکری چونکی پاش سالی ۱۹٤۰ شار رو بە گەورەی رویشست ئەندازەکەی فروان بو وچەند گەریکی تازە دامەزرا لەگل ئەمشدا سالی ۱۹۵۷ ژمارەی هەولیر گەیشتە نزیکەی پنجاهە زارکەس ایتر لەمە وادەر ئەکەویت کە هەولیری ئیستا ئەگەر بەر چاو بکری لەگل دیمەنی کونی زور گوراوە وپیش کەوتوە،ژمارەی دە کەرت لە جاران زیاترە وشیوەی ئیستەی وەدیمەنی هەر وکو هەر شاریکی پیش کەوتوی ترە لەسەر جیهان • ئیمە لەم بەشە بە کورتی دەربارەی شاری هەولیر باسمان کرد لە باسیکی تر پیویستە کە لە بابت کومەلایتی ئەم شارە بدووین لەبەر ئەوی زانین ئەم شتانە زور بەمەبەستە وبەسودە ولاپەرەك لە میژوی کونی ئەم ولاتە روشنا ئەکاتەوە •

## ( بەش سێیەم )

# ژیان وەکومەلایەتی کونی هەولیر

زنجیرەی دوهەم لەم وتارە بە ناوی دیمەنی هەولیر بلاوکرایەوە لەم باسە چەند لاپەریك لە میژوو کومە لایتی ژیان لە شاری هەولیر وديهاتەکانی باس ئەکەین •

۱ ــ جل وبەرگ :

جلو بەرگی هەولیر بەرگی کوردایەتی بو چاکەتو پانتول تەنها لــە لاین مأمورانی دەولەت بەکار ئەهات ــ بە بونەی خوێندن وقوتابیخانە ئەم بەرگە ئەوروپیە بلاو بووە ئەما جل وبەرگی خو ولاتی بەم تەورە بو ــ شــارستانی کەوا وەسلطەی لەبەر ئەکرد وەبوسەر جامەدانیــــان ئەبەست ولەپشــــت پشتێن ئەبەست وپیاوی ماقول عەبایان لەبەر ئەکرد • لادیی پیاوی پیریـان زوریان ئەم پایەتە جلەیان بەکار ئەهینا •

لەگەل ئەمشدا ئەم تەرزە بەرگە لەلایان دانشتوانی قەلا بەکار ئەهـات زوربەی جی‌نشین گەرەکەکانی کورتەك وجی‌نشین گونـدەکان کورتــەك وەشاروالیان لەبەر ئەکرد لە هەندی ناوچەی کورد بە مرادخانی ناو ئەبری ، لەهەموکات پشتبین لە پشت ئەبەسترا وهەندی لادیی هەولیر رانك وچوغلیان بە کار ئەهینا لەگەل پەستەك •

وه لەلادی قاپوتی لباد شــوان ونوبەچی بەکاریان ئەهینــا بو روژی ساردی زستان •

پیلاو قوندره بو ژن وپیاو وەکریکار جوتیار وسەپان لە زستان کالکیان لەپی ئەکرد ولە هاوین کلاش بەکار ئەهات •

جل وەبەرگی ژن هەمە دەستوری ئیستە بو هەر کراس وکەوا وەسنخمە بەکار ئەهات وهەوری ، مشکی لەسەر ئەبەسترا •

وژن لەشار ( چارچەف وەپیچمەیان ) بەخووە دائەپوشــت وەرویــان دەرنەئەکەوت وە لەزستان جزمــەیان لەپی ئەکرد ژ نی لادیی وگــەرکەکانی خواری قەلات رویان دەر ئەکەوت بەلام خویان بەچاروگە دائەپوشت •

**٢ ـ ئاو ـ چرار ـ سوتەمەنی :**

پیش سالی ١٩٣٠ بە ولاغ سەقا ئاوی ئەبرد بو مالانی قەلات وەئەو ئاوە لە کاریزی هەولیر ویا لە کاریزی میری ئەهات بە جو گەلە بوحەوزی ، نــاو شار کە لە دەرگای بازار بووە لەو شوینە سەقا ئاوی ئەبرد ، قەلات •

ئەماجی‌نشین گەرەکانی کورتەك ( ئەی خواروی قەلا ) ئــەم مالانــە هەندیکیان ئاوی بیریان بەکار ئەهینا وهەندیکی تــر ئــاوی کاریزیــان ئەخواردوە • وەپاش ماوەیك شارستانی دەستی کرد کەئاوی کاریــزی میری بە بوری دابەش بە سەرمالانی بکات •

چرای شەو ( فانوس ) پی ئەوترا ویا ( قودیلە نەوت ) مالی بی‌دەســت هەلات گەلیکی فانوسیان ئەبو قودیلە ویا لامپایان بو شەو بە کاریان ئەهینــا ئەی هەمو ئەم بابتە چرایانە بە نەوت پی ئەبون •

وله زەماوند وشـایی وەمەولود ( مومیـان ) پی ئەكرد ــ ایتر بە جورە نەختی روشنای وەروناكی بو شەو دورست ئەكرا تا پیـابونی كهرباء پـاش سالی ١٩٣٦ ٠

ئەگەر لە كهرباء بسپرسین نەك بو ولاتی ئیمە ئەم شتە تازەیە پیـا بونی وبلاو بونی زور كون نیە وئەگەرینەوە سەرەتای ئەم چەرخە ٠

وبو سوتەمەنی ئەی ئاگری زستان دار وە رەژو ( خەلوز ) وەلەلادی كاوە پوشی بەكار ئەهات ، وهەر بەدار ویاكا قشپل ، ئاگر ئەكرا بو دورست كردنی شیو وەخواردەمەنی ــ پاش سالی ١٩٤٠ وردە وردە نەوت بوسـوتەمەنی وبودورست كردنی خواردن بە كارهات لەسالی ١٩٦٠ ٠

غاز پیا بو وزور كەس لەجیاتی نەوت بو ئاگری زسـتان وبودورست كردنی شیو بەكاریان هینا هەرچەند كهرباء پیش سالی ١٩٤٠ پیـا بو بە لام لە هاوینی پاش ١٩٤٠ انجا ( پانكە ) بەكار هات وهەروها ٠

**بو ئاوی سارد بەفری چیا ئەخرا چال**

لە گوندانی شەقلاوە وپیرمام وئەم بەفرە لە هاوینی ئەهیزا بو شـار بو ئاوی سارد وە ماستاوی پی ئەكرا ، پاش سالی ١٩٤١ ( بوز ) پیا بو ئـەی بەفری دورست كراو بە مەكینە وپاش سالی ١٩٥٨ انجا ( ثلاجە ) پیا بو لـە هەولیر ٠

**٣ ــ اوتومبیل ــ رادیو ــ تلفزیون ــ**

یكەم ئوتومبیل لە سالی ١٩١٥ هاتوتە هەولیربو بو خلیل پاشـا سـەر لەشكری عثمانلی تەرخان كرابو وەئەلین شوفیرەكەی ( المان بووە ) ، پـاش سالی ١٩٢٢ اوتومبیل بو ئامو شو لە بەینی هەولیر ــ وموصل بەكار هاتووە

وپاش سالی ۱۹۲۳ ــ ۱۹۲٤ انجا بو رویشتن بو کرکوك بغدا بەکار هەتوە ، پیش ماوەی ناوبراو تەنها ئەسپ وە ولاغی تر بووە بو کاروانی وسەفەر .

ورادیو کە بە پاتری کار ئەکات پاش سالی ۱۹۳٤ لە هەولیر پیـــابوە وئەوەی بە کهرباء کار ئەکات پاش سالی ۱۹٤۱ بو هەولیر هینراوە .

ئەما تلفزیون پاش سالی ۱۹٦۰ لە هەولیر پیـــا بووە پاش ئەوەی کـــە لە موصل تەریباتی بناغەی پروگرامی تلفزیون دورست کرا .

پیش سالی ۱۹۳۷ ئەگەر مام وستایەك لە قوتابیخانە باس بونی تلفزیون ویا شتیکی دورست کراوی تازەی وای باس بکرادیە هیچ کەس براویی بـــەم قسەیە نە ئەکرد وهەروها لە سالی ۱۹٦۷ کە امریکانی چونە ســـەر مانگ زور کەس ئەی وت ئەم قسەیە راست نیە وە هتا ئیمتش زور کەس بروا بەم گفتە ناکات ایتر ئەم جورە بیرو باورە دواکەوتوە مەبەستی نە خویندەواریە ئـــەبی بزانین خویندن وپیش کەوتی لە زانستی ریگای بەرز بونی گـــەل ونشتمانە ونەخویندەوای وە لات تاریك ئەکات وگەل بەدوا ئەخات .

**٤ ــ شاراستانی ــ**

کاروباری شارستان بنگەی ئەگەریتەوە سالی ۱۸۸٥ لەم سالەدا شارستانی هەولیر ــ بلدیە دامەزراوە ئەم دەست گاهە زور کاروباری شاری ئەبینی وەك کولان پاك کردنەوە وزبلی مالان گواستنەوە بودەروی شـــار وشەو کولان وجادەکانی شار بە فانوس روناك ئەکرا هەروها بلدیـــە نوبـــەچی بو بازار وگەرەکەکانی شار دائەنا ئەم نوبەچیانە لە ژیر چـــاوە دیری دائرەی پولیس پاسەوانی شاریان ئەکرد .

ئە شار دو جیگا بو بە مەیدان ناو ئەبرا یەك یان مەیدانی دار فروشتن کە

دار وخلوز تیا ئەفروشرا هەروها هەندی میوەجاتی گوندەکانی چیائەهاتە ئەم مەیدانە بو فروشتن • مەیدانی دو هەم پیان ئەوت میدانی ولاغ فروشتن مەر بزن وە گاوەمەنگا لەم مەیدانە ئەکرا هەروها ئەم جیگایە کرینی وفروشتن بەرزە ولاغیی تیا ئەکرا وەك کرینی ئەسپ ــ ماین ــ ئیستر • ئەم هــەر دو مەیدانە لە ژیر چاوە دیری شارستانی بووە •

وگورە پانیکی سیەم شتی کونەی مالان ویا شتی کە خاوەن مــال لە خوی زیاد بو لەو جیگایە ئەفروشرا، زورشت لە لاین چەند پیرە ژن ئەفروشرا وە ئەم ئافرەتان بەم کارە خەریك بون شتی بە نرخ ( چارچی جاری بو ئــەدا) هەر کەس زیادی بکرادیە ئەوشتە بو ئەو ئەبو •

وەئەم گورەپانە بە مەیدانی ( قاری بازار ) یا بە دلال خانە ناو ئەبرا •

ئەم سی مەیدانە لە لایان شارستانی چاوە دیری ئەکرا وهەندی رسومات لە لاین باج گیری شارستانی وەرئەگیرا •

**ە ــ ژن خواستن :**

بە زەماوند پاشایی ناو ئەبرا ژن مارە کردن بە پی ئاینی اسلام جی بەجی ئەکرا لە لای مەلا ویا قازی مارە ئەبرا •

وەژن گواستنەوە لە مالی بوك بو مالی زاوا لە شوینی نزیك بەپی بوکیان ئەهینا بو مالی زاوا وە لە شوینی دور بە ولاغ ژنیان ئەگواستەوە لە دەرگای مالی زاوا ــ زاوایان یەکی لە خزمەکانی شەکر وپارەیان بە سەر بوك هــەل ئەدا وبەشەو کە زوا ئەچوە لای بوك وبە تەواو بونی زاوایــەتی یەکی لــە والاداش زاواکان ویا خزمیکی زاوا هەر لەو کاتەدا تەقــەی بە تفنگ ئەکــرد ئەمەش زور جار یك تەقە ئەبو یا س زیاتر نە ئەبو •

وپیش روژی بوك گواستنەوە مالی زاوا ئاهەنگیان ئەکرد ومەولود بە شەو ئەخیندرایەوە •

ناسیاوی مالی زاوا وە خزمەکان روژی بوك گواستنەوە هەر کەس شتیکی بە ناو باروبو یا بە ناو پیروزی ئەیان برد ئەم شتە زور جار پارە ئەبو وەیا شتیکی بە نرخ وەك مافوری ئەو سەعاتیك •

بوك پاش (٣) روژ لە ناو مالی خوی هەندی دیاری دابەش خزمانی مالی زاوای ئەکرد •

وروژی حەوتم ئافرەتان خزمی مالی بوك وزاوا هەر مالی نەختی پارەی ئەبرد بو بوك •

وبوك نزیکەی شەش مانگ نە ئەچوە مالی باوکی دوایی کە ئەچوە مالی باوکی یەکەم جار نزیکە دە روژ زیاتر ئەمایەوە ژنە خزمانی مالی زاوا ئەچون ئەیان هینایەوە •

ئاهەنگ شار هەر بە گورانی ئەبو روژی زەماوەند کەم جار هەل پەرکی ئەکرا بەلام لە لادی هەر دەم لە زەماوند دول وزرنا لیدراوە وهەل پەرکی دامەزراوە •

٦ ــ منال بە خیوی کردن ــ

پاش بونی منال بە (٣) روژ کور لە لایان باپیری ویا باوکی ناوی لی ئەنرا کچ لە لایان داپیری ویا دایکی ناوی لی ئەنرا •

منال کە ئەبووە حەوت روژە لە لایان پیرە میردیکی دانای خزم ویا خەلکی گەرك بە گوی چەند گفتیك ئەوترا ئەلین مەبەست لەم شتە کە ئەم

مناله له سه‌ر ره‌وشتیکی چاك گه‌وره ببی منـــال بون به یارمه‌تی مامانی ژن ئه‌بو ، ئه‌م مامانه ناوکی منالی ئه‌بریه‌وه وه ئاگاداری ته‌ندروستی منـــال ئه‌بو هه‌تا چل روژ به‌سه‌ر بونی رائه‌بوری •

ئه‌م ماماناته ئه‌م کاره فه‌رمانیـــان بو وه کـــری خویان له خاوه‌ن منـــال وه‌رئه‌گرت •

منال به شیری دایکی به خیوی ئه‌کرا ئه‌گه‌ر دایکی منال نه‌خوش بوایه یاشیری ئافرت که‌م بوایه ژنی جیران وه خزم جار به‌جار مه‌مکیان ئه‌دا بـــه‌م مناله ، ئه‌گه‌ر خاوه‌ن منال ده‌وله‌مند بوایه مه‌مك دایان بو ئه‌گیرا به مانگانه•

وئه‌مانه‌ی منالیان نه‌ئه‌ما هه‌ندیکیان منالی خویان ئه‌دا به‌یکی له مـــالی خوی به‌خیوی بکات ویا ئه‌گه‌ر خاوه‌ن منال پاره‌دار بایه شوینکی تایبـــه‌تی ته‌رخان ئه‌کرد که مناله‌که‌ی که ژنی له‌م جیگایه به‌خیوی بکات •

ومنالی کور پاش یك ساله خه‌ته‌نه ئه‌کرا وه به بونه‌ی خه‌ته‌نه ئه‌گـــه‌ر باوکی منال ده‌وله‌مند بایه ئاهنگی بو ئه‌کرا خزم ناسیاو دیارییان بو ئه‌هینا•

ومنال پاش حه‌وت ساله له مزگه‌وت ملا فیری خویندن ونوسینی ئه‌کرد• ئه‌وانه‌ی که ئه‌چون بو خویندن زور که‌م بون وه‌ئه‌وه‌ی ئه‌ی خویند پاش سی چار سال که فیری خویندن ئه‌بو وازی له خویندن ئه‌هینا ، ئه‌وانه‌ی مه‌به‌ستیان بوببنه ملا یا خویندواریکی ته‌واو ماوه‌یکی زور ئه‌یان خویند •

مه‌به‌ستیان بوببنه ملا یا خویندواریکی ته‌واو ماوه‌یکی زور ئه‌یان خویند •

## ٧ ــ چه‌ژن :

چه‌ژنه‌کانی ولاتی شاری هه‌ولیر گه‌لی چه‌ژنی به پی ئاینی اســلامه ئه‌م چه‌ژنانه ــ چه‌ژنی رمضان وچه‌ژنی قوربان ــ وچه‌ژنی مولودی پیغمبـــه‌ر

محمد (ص) وئەمسی چەژنە بەگرنگی ئەگیری ـ ولەچەژن کورد لە یکتری چەژن پیروزی ئەکەن وبو چژنە پیروزی لە لەدیوانخانە گوند یا دیوانخانەی گەرەك کو ئەبونەوە وەهەر وها لە مزگەوت تیکرا نویژی چەژن ئەکەن وەملا ئاموژگاری ئەکات •

لە زور گوند وا پیشەیە لە کونەوە کە خاوەن مالەکان چەشتی چەژن بیتە دیوانخانەی گوند کە تیکرا پیاوەکان نان بخون •

هەمو مالیك ئەم چەشتە ئەباتە دیوانخانە بیجگە ئەو کسانەی کـە زور بی دەست هەلات بن ویا خاوەن مال نەبن ئەو پیش ماوەیکی کورت یکەکیان لی مردوبی ئەی خاوەن شین بونە •

لە چەژنی رمضـان وەقوربان خاوەن مال جلوبەرگی تازە ئەکری بو مندالەکانی وەخیزانی وە چەژنانە یان ئەداتی وە ئەوکسانەی کە زور بەدست هەلات ویاد ولەند بن ئەم کەسانە چەژنانیان ئەدەن بەخزمو دستو پی خوریان• ولە چەژنی قوربان سەر برینی مەریك، یا گایك لە لاین پیاوی دەولەمند پیشەبەکی کونە زور پەسەند بووە ـ ئەما لەچـەژنی ١٢ ( ربیعی یکـەم ) ئەی لە روژی بونی پیغمبەر (ص) پیاوی بە دەست هەلات مولودیان ئەکرد لە مالیان یا لە مزگەوت •

ئەما چەژنی نەوروز پیش سالی ١٩٥٠ تەنها لە دیهاتی چیا ئاهەنگی بو بو ئەکرا پاش سالی ١٩٥١ انجا خەلکی شاری هەولیر دەستیان کردوە بەیادی روژی نەوروز هەرسال لە کاتیخوی کە ئەکەویتە ٢١ مارت سالیزاینی•

## (بەش چوارەم)

# سەرگزشتەی ئاوەدانی وە ئابوری بەرهەم لە ولاتی هەولیر

لە وەتارانی پیشو هەوالی زورشتی کونی ئەم شارە پاش لی کوینــەوە باس کراوە لەم بەشە کورتە هــەوالیکی ئاوەدانی شـــار وەخواردەمەنی وبەرهەمی ئەم وولاتە وەئابوری باس ئەکری لەم روەوە ئەم باســە تەنهـــا پەیوندی بە کومەلایتی هەیە کە گواراوە بە چەشنیکی تازە •

۱ ـ خانو بەرە :

خانو بەرەی قەلانی هەولیر وەگەرکەکانی خوارەوە کە بە کورتەك نـــاو ئەبرا ، زربەی ئەم دەستو بەرەیە بە کەرپوچ (خشتی سور کراوە) دورســـت کراوە وهەر خانووی چەند ژوری تیا بووە ، هەندی ژور لاخانویکی تیـــا هەبو لە قەلا (کە دەرگای ئەم ژورە لە ناو ژورە گەورەکە ئەبوـــهەروەها لە هەر مالی دو بەر هیوانی تیا بو یکیان بو دانشتن وە دوهەمیان بو شـــیوی لینان وە جیگای شیو کردن لە بەرهەیوان بو نەك وەك ئیستە لە ژوری بی لەبەر دوکەل چونکی ئامەدەکردنی خواردەمەنی بە ئاگری دار ویا کا وکوتەل ئەکرا •

وخانو بەرە زوری یك نهوم بو وە هەندی خانوی پیاوی بە دەست هەلات بە دو نهوم ئەکرا وە ژورەکانی سەرەوە بە کوشك ناو ئەدران ، وەگەلی مالی قەلا ئەندازەی زور بچوك بو لە بەرئەوە زور جار لە پایەی سەرەوە دو کوشك لە گەل بەرهەیوانی دورست ئەکرا وە لەگەلی سەربانی قەلا لەسەروە بەرهیوانیکی بچوك هەبو بو پاریزتنی جیگاو بەرە ولیف وەبالیفی نوستنی هاوینە تا لە سەربان لەبەر تریشکی روژ نەمینی وەلەم جیگایە دابنری تا دو بارە بو ئیوارە وە شەو لەسەربان رابخرینەوە •

وە لە سوچی شار ئەگەر خانو بەریکی گەورە وە گرنك دورست بکرابا بەوە دار وەباغی تیا بایە ئەم خانو وە بالەخانەیە بە قصر ناو ئەبرا •

وەك قصری ملا افندی لە باداوە وە قصری عطاء الله اغا لەو پەری گەرکی خانقاە وەسید ئاوا •

وەدانشتوانی شار هەر کەس خانوی خوی بو ، ئەما کریکاری تازە هاتو بو شار یا ورنجبەری کشتوکال کە جوتیار وە سەپانیان پی ئەوترا ئەمانە زوریان بی خانو بوون پیاوی بە دەست هەلات کە خاوەنی زەوی وە کشتوکال بون لە گەرکانی خواروی قەلا لە گەرگی عەرب وە گەرکی خانقاە ( حەساریان ) بو بو جوتیار وە سەپانی خویان وەئەگەر ژوری زیادی بایە وە یا ئەم حەسارە بو کشتوکال تەرخان نەکرابو ئەم ژورانە بەکری ئەدران بە کریکار بە مانگانە • وەئەم حەسارانە بەناوی خاوەنی وەیا بەناوی ئەوەی دورستی کردوە ناو ئەبرا وەهەندی حەسار ناوی بە ناوی ئەم شوینە ئەبرا کە تیایا دورست کرابو • وە ئەم حەسارانە بە خشتی سور کراو دورست کرابون وە هەندیکی بە خشتی کال •

دەرگای ژور ودەرگای دەروە وکلیلەی دەرگا و جاکوش لیدانی دەرگا بە شیوەیە بو کە بە تەواوی ئیستە گوراوە • وەبازاری گەوریی هەولیر لە کونەوە تا ئیستە هەر لە لەشوینی خویتی وە لەم بازارە ١٢ قەیسری تیا بووە تارادەیك ئەم قەیسریانە لەسەر نقشەی کونیان هەر بەردەوامن وە لە ناو بازار زور دوکانی تر هەر بووە کەژمارەبی لەصەدو-دوصەد زیاتر بووە لەگەل بونی چەند چایخانە وە جیگای تالبند — وە خمجی — وچەند خانیك کەبو وەلاغی کاروانی وە بو حیوان — بە کار هاتووە ئەمادوکانە لەسەر شەقام زور کەم بووە لەگەل چەند چایخانەیك — وپاش سالی ١٩٣٠ وردە وردە دوکان لە سەر شەقامە کونەکانی دورست کرا • وە لەکاتی ناو براو تەنها •

س شەقام لەشار بووە — مظفریە — خانزاد — صلاح الدین وەپاش سالی ١٩٤٠ پەیدل پەی سال دوای سال چەند جادە وەشەقامی تازە لە ناو شار کرایەوە •

لە کونەوە لە شار گەلی مزگەوت وتکیە هەر هەیووە• دەولت زور کەم بنای بووە تەنها لە سالی ١٩٣٠ سرای کونی قەلات — سەرای متصرفیت لە خواروە وەبنایك بو نەخوش خانە ویك قوتابیخانە — وەشاراستانی لە گەل دوس خانو وحصار بە کری گیرا بو بو چەند دائرەی تر ، لە کونەوە یەك حەمام لەقەلاتی بووە ولە کورتەك چوار حەمامی تیا بووە •

**دورست کردنی خانو**

بە کەرپوچ بو لە گەل قوری خولە سور بە تەنهای یاقور وە گج ئەو قور وەقسل بو دیوار بلند کردن بەکار ئەهات — وەبناغەی خانو قول ئەکرا تا ئەگیشتە صاغە لە قەلا بناغە زور قول ئەبو هەندی کەرت چوار گەز زیاتر

ئەکولرا ئەمجا بەرد ریژ ئەکرا وە ئەکوترا وەپاشتر بە کەرپوج وە بە قسلو مشکی دورست ئەکرا ، پاش سالی ۱۹۳۰ چمنتو پیا بو وردە وردە لە جیاتی قسلو مشکی بە کار هات تا بە جاری قسلو مشکی بە کار هینانی بەتل بو•

شایانی وتنە قسلو مشکی تیکل ئەکرا وەئەگیرا س(۳) روژ ئەمایەوە بو ئەوە بە تەواوی بخوسی ئەمجا بەکار ئەهات ئەم شتە بەرگەی ئاوی ئەگرت وە لە حمام وە دەست شور وە جوگەی ئاو بەکار ئەهات وەبو دورست کردنی حەوزی ئاو • کەرپوچ (خشتی سور لە لاین کورچی دورست ئەکرا وجیگای کونی کورەکان لە سەر بەست بو لە گەرکی تعجیل ــ ئەما پیوستی تر وە هەمو کارو باری هەر خانو وە بەرەی تریشی لە لایان وەستا وەکریکار بەجی ئەهات هەر یك وەستا لە گەل چەند شاگردی شارەزا ئیشە کەیان ئەکرد ــ بو سپی کردن ــ وە سەربان تواوکردن ــ ودیواری صواغ کردن هەمو کاری ئەم وستایە ئەی کرد وەك ئیستە ئەبو هەر کاری زاناو وستای خوی ببی وە پیوستی تری خانو تەنها بو دەرگا ،پەنجرە لە لایان نجار وە ئاسنگەر تەواو ئەبو بە گارگەی خو ولاتی •

**۲ ــ ناو مال ــ**

ناو مال بە دەستوری کونی بە هیچ جوریك لە تەرزی ناو مالی ئیستە نەئەچو ــ کەم مالی تەختی نوستنی بو وە ئەم تەختە دار تاش لە داری خو ولاتی دورستی ئەکرد ، ئەم تەختی نوستنە تەنها بو هاوین لە سەربنا بەکار ئەهات •

ئەما لە ناو ژور دوشەك لە سەر رایخ دا ئەنرا وە بالیف ( سەرین ) زور جار شوینی پال بە دیواری خانوی ئەدا انجا لیفە جاجم بو سەر پوش بەکار

ئەهینرا ئەمە جیگای نوستن ـ بە شـەو رائەخرا ، بیانی جیگا کوئەکرایەوە• ئەمەش بو پاکو تەمیزی بو وە دوبارە کـە جیگا فروان بی بو دانشـتن• وە بودانشتن لە مالان ژوری نوستن وە داتشتن هەریك بو ـ جیگای دانشتن لە سەر رایخ بو گەرمانور بی بابە رەویا لبـاد وە دوشك لە پال دیوار دائەنرا وەبالیفی ئەخراوە قەدی بو دانشتن وپال دانەوە بو روژو شەو، پیش سـالی ١٩٣٠ لە هیچ مالی کورسی وە میز وە قەنفە بە کار نە ئەهات ، ناو مالی زیاد ئەگەر جلکو بەرگ بابە ئەخرا ناو کوتالیکی دورمان کراو کە بە ( بوخچـە) ناو ئەبرا وشتی زیادی ترا ئەخرا صندوقی دار کە لە لاین دار تـاش بازاری هەولیر دورست ئەکرا ، ولە هەر ژوری صندوقیگی گەوریەی تیا ئەبو •

لە خانوانی قەلات لە چینی سـەرەوەی دیوارکان ئـەی لە بن میچی کولانکی تیا ئەکرا کە بە ( تەخچە ) ناو ئەبرا بو رازانەوەی مال زور شـتی جوان کە لە شوشە وەفەخوری دورست کرا ئەخرا ئەم کولانکانە •

وە بوجوانی زور خانوی قەلا کە سـەری بە کاریتەی دار وە بەشـقلە دار دا ئەپوشرا دیوی ژورەوەی بەتەختە پوش ئەکرا لە لایان دارتاش •

لە جیاتی دار چینکو بە کار ئەهات ئەم دار پوشە رنگا ورەنك بە بویە ئەکرا •

وخواردەمەنی وەك ساوار ـوەبروش ـ وە برنج وگەنم وەنوك ونسیك ئەخرا کەندو کە لەقور دورست کرابو •

رون ـ وە پەنیر ـ و گوشتی سور کراوەر و گوشـتی خیی لی دراوە ئەخرا جەرە •

مەنجەل ــ قاپ ــ سەرپوش قاپ ــ سینی ــ تەشت ــ وە هەندی چەشنە گەوچك ــوە مەسینەــ وە گوم گوم ئەم شتانە کە بودورست کردنی شیو بەکار ئەهینرا بە کاردەستی مزگەری هەولیر ئەکرا .

وە کەوچکی دار ــ وکوتك ــ وتــە شی بوریتسن خوری و پــەمو ، وە بازو وە تیروك وەفرشەی دار ــ وەملاکی ماستاو ئەم کارو بارە لە دیهاتی خوشناوەتی دورست ئەکرا و بوشار ئەهینرا .

هەروها لە دیهاتی شقلاوە وپیرمام و گوندەکانی تری ناو خوشناوەتی لە چلوی دار ــ سەبت ــ وە قەرتالە وەسەوەشیر وە شتی تر بو ناو مال بەم جورە دورستیان ئەکرد وە ئەیان هینا بو شــار وهەروها تەسبیحی قــەزوان وەگوچان وزورشتی تر لەم بابەتەوە .

وە مەسینەی قور وە کوپەی ئاو ــوە شەربەی ئاو لە شیوەی بەرداغــ مەرکانی گول زورشت لەم بابتە کورەچیەکانی هەولیر لە کورە بەسور کراوی ئامەدەیان ئەکرد .

وشتی تر لە پیستە دورست ئەکرا وەك هیزەی رون وە دمیکەی ئاو ــ وروایە کە سەقا ئاویان پی ئەگوازتەوە ــ وە بیژنگ ــ ئەم کردوانەش هــەر لە بازاری هەولیر پاش دەباغ کردنی پیستە دورست ئەکرا .

وە رایخ وەك مافور وەلباد ــ وە بەرە ــ وە دوشك وە بالیفــ و جاجم (وە دو گرتی توژ لە خوری دورست کراو) وە دوگرتی پیخەف کە لە دەزوی پەمو ئەهونرایەوە و ئەم کارو بارەش هەندیکی لە شار دورســت ئەکــرا و هەندیکی لە لادی ئەکرا .

لەم باسە بو خوێندەواران روشنا بو کە هەمو کەلو پەلی ناو مال بە تەرزی کونی لە کردوەی خوی ولاتی بو و ئەم دەستورە بە تەواوی شیوەکەی ئەمرو گوراوە •

وکار و باری ناو مال هەمو خرا بووە پال کابانی مال ئەم کابانە گەورە تیرن ژن بو لەو مالە وە ایشو کاری مالی جی بەچی ئەکرد و ژنانی تر لە مال وە یا کچەکان هەر کەس بەش خوی یارمەتی ئەدا • یکەم ئیش لە ناو مال ئەوە بو سەر لە بیانی خانو مالین بە گیسە پاك بکرینەو ئەمجا جیگای خەوتن کوبکرینەوە وەیا تاغ بخرینە سەر هەرزالە پاشتر پیوست بو سماور پی بکری وچایە وبەر چایی ئامدە بکری وە سەماور بە خەلوز ( رەژو ) گەرم ئەکرا وپاش چای خواردنەوە خاوەن مال وپیاوانی تر هەرکەس رو بە ئیشی خوی ئەرویشت •

وپیش سالی ١٩٣٠ لە هەولیر و لە گوندکان نیوەرو چیشت نە ئەکرا شتی سوك ئەخورا وە نانی ئیوارە شیوی بو ئامەدە ئەکرا لە لایان کابانی مال • هەروها خانو بەرە و ناو مال بەم تەرزە بو وئەگەر سەرنج بدەین ئەم دەستورە باس کراوە کە پەیوندی بە کومەلایتی و ژیانی کون هەولیرەکانە بو ماوەی چەند چەرخی تا نزیکە سالی ١٩٣٠ ئەم جورە ژیانە لەم ولاتە روا بو و جیگای گرتبو ، وە وینەی زور شت لەم کردەوانە بە تەواوی ئیستە بزر بووە و ئەم شتانەی هیشتا نیوە بە نیوە لە سەر رەگزی کەون ماوون وە تا ئیستە کەمیك بەرچاوە ئەم چەشنە پاش ماوەیك بەرو گوران ئەچن و لە دوای چەند سالی تر وینەی ژیانی کون بە جاری لەبەر چاو نامینی و لە دەفتری میژو ئەنوسری •

**٢ ـ خواردەمەنی : ـ**

لە مەو بەر هەروەك وتمان هەمە رەنگ وەچەشنە شیو ( چیشت ) بە ئاگری دار وە یا بە کاو کوتەل وە قەسل ئەکرا وە سوتەمەنی نەوت ـ وە غاز ـ وکهرباء نەبو پیش سالی ١٩٣٠ ـ هەر چەند نەوت کەمو زور پیا ئەبو بەلام تەنها بو چرا بەکار ئەهات •

وپیش سالی ١٩٣٠ لە شار و گوندەکان برنج بو خواردن زور کەم بەکار ئەهات پیا وی بە دەست هەلات ئەگەر میوانی نەبوایە بەلکو لە حەوت روژ جاریك پلاو گوشت بو چیشت ئیواریك دورست ئەکرا ، ئەما کریکار وە رنجبەر لەشار بەلکو لە مانگی جاری برنجی ئەکردە شیو وە دانشتوانی دیهاتی دە شتی هەولیر رنجبەر وە سپان وە جوتیار وابو سالی چەژنو چەژن برنجیان بەکار ئەهینا و چەند جار لە مانگی رەمضان ئەگر ئەوکەسە بە روژو بایە ، ئەما دیهاتی بەر ئاو و دیهاتی چیا زیاتر برنجیان بە کار ئەهینا ئەگەر رنج لە زەوی گوندیان بکرا بایە •

ساوەر وەگەنمە کوتاو ـ وە نیسك ـ وە بروش ـ وە نوك وە داندوك ـ وە کەشك ـ وە دوغاوا ـ ئەم خواردمەنیان شیوی ئەم ولاتە بو وە خواردنی تر • هیلکە ـ ماست ـ دوشاو ـ وەخورما ـ وپەنیر گەلی شتی تر بەکار ئەهات •

ئەما سەبزەی زستان لە شاری هەولیر تەنها تور ـ وشیلم ـ وپیاز ـ و کەروز وسلق وە چوندر وباقلا بو و لەهاوینی هەمە رەنگ سەبزە بو وەك ئیستە بووە •

زورشت کە ئیستە بە کار دیت پیشی سالی ١٩٣٠ لە هەولیر نە ئەچاندرا

و له شوینی تر یش ئەم شتانە بو هەولیر کەس نەی ئەهینا ، ئەی پیش سالی ۱۹۳۰ ــ بطاطە ــ قەرنابیت ــ فاصولیا ــ اسپناغ لە هەولیر نەبو و بەکار نە ئەهات •

وله پیاوی گەورە لە منالی گوم لی بووە کە ئەلین نزیکـەی ( ۱۰۰ ) صەدسال له مەوبەر لەم ولاتە توتن ــ وچای ــ وطماطە نـەبووە و بەکـار نەهاتوه • و لە بابەت میوە جات هەمە چەشنە میوەجات لە دیهاتی خوشناوەتی بو هەولیر لە هاوین و پایز هاتووە و لە زستان هەنگونـو گویزـوە باوی ( بادەم ) و میوژ ــ و قەیس ــ و کشمش ــ و ژاژیو پەنیر • ئەم چەشـنە بەرهەمانە هەمو خو ولاتی بووە لە بازار ریبا ئەبو ــ وە گەلی جـار ئافرەتی کوچەر وەك ژنە بولی پایزان کە لە کویستان هاتوینەوە ئەم شتانەیان هیناوە بو شار روژ دوای روژ لە مالان بە پارە فروشتویانە ویـا بەشەکر و چای و خورما وە ساور و بروش ئالو گوریان کردوە • هەر شتی کە بەرهەمی ولاتی هەولیر نەبووە بیجگە خورمال وە قەسـب شتی تر خاوەن دوکان لە جیگای تروە نەیان ئەهینـا وەك پرتقالـموز ــ الالەنگی ــ نارنج ــ لیموموترش ــ بلکو زور مالی شارستانی سـالی جاری و یا دو جار ئەم چەشـنە میوەیان نە ئەخوارد لە بازار نە بو وەجار بە جار بە دیاری لە بغداد و کرکوك بویـان ئەهات • گەلی چەشنە شیو لە هەولیر ئیستە زور بابەتی وەك جارانە تەنهـا کردنی هەندی شیوی کونی قەلاتی هەولیر لە نەماوە ، بەشە شویکی تر زور کەم کەس ماوە دورستی بکات •

تا سالی ۱۹٤۰ هەمو دانشتوانی شار و گوندەکان پیش زستان ساوەر و گەنمەکوتاو ــ وە پروش ــ و نیسك نوك هەرشتە پیاز رون بو زسـتان

ئامەدە ئەکرا وە دائەکرا ٠

پیوست بو هەر مالی ساوار بکولین ولی بکات ــ و بروش بەدەست تاری بەرد بی هیری و گەنماکوت بە دنگ پوختە بکری ــ هەرشتە بە کردویکی تایبەتی بکری و دابەستی مەر سەر بیری و گوشتلە کە بکری بە قاورمە ویا لە ناو خوی ئاو وە لە ناو جەرە هەل بگیری بەم جورە خواردەمەنی بو زستان ئامەدە ئەکرا ٠

و شایانی باسە ــ دانشتوانی شار ئالودەی گوشتی مەر بون ــ گوشتی بزن وە رەشە ولاغ قصابی شار سەریان نە ئەبری چونگی گوشتی گاو بزن کەس نەی ئەکری پاش سالی ١٩٣٠ وردە وردە خەلك فیری بە کار هینان گوشتی گا وە مانگا بون ٠

گوشتی مریشك قاز مراوی ــ هیلکە لە هاوین لە دوا مانگی بهار تا پایز بە کار نە ئەهینرا ٠

وەماسی وردە دانشتوانی هەولیر بە کاریان نە هینا تەنها ماسی گەورە کە لە بهاری لەزەیی گەورە ئەهینرا ئەم گوشتە نەرمکە لە بازار ئەفروشرا ٠ هەروەك وترا زور چەشنە شیوی هەولیر وە دزەیی و خوشناوەتی لە سەر رەگزی کونی ماوەتەوە بەلام هەر شیویك دەست کاری زوری پی بوی کەم بە کار دیت ژنو مال لە کردنی خویان لا ئەدەن وە مەبەستی لەمە ئەوەیە کە هەندی کابان و خیزان کاری تریان هیە بیجگە بەریوە بردنی مال ومنال ٠ و زیاتر لەمە مالی کون چەند مالیکی تیابو ئەی کور و برای لە یك مال ئەژیان لەبەر ئەوە لەتوانا بو هەر چەشنە شیوی ئامەدە بکری ئەما ئیستە ئافرەت خوی لەم تەرحە کارە لا ئەدات پەسندی ئەم شیوە ئەکات کە بەسانای

جی بەجی بکری •

**٤ ـ کارو باری دانشتوانی ولاتی هەولیر : ـ**

هەمە چەشن کارو بار لە کومەلایتی ئەم ولاتە بووە بە شـــیوەیك کە بە کە بە تواوی پی ویستی ژیان وە داخوازی بەریوە چون وە بەرهـــەمی خو ولاتی بوە بە گرنگ ترین کار لە هەولیر کشتوکال بووە هەوالی کشتوکال لە باسیکی تایبەتی لە وتاریکی تر ئەی نوسینەوە •

و لەم بەشە لە کار کردەوی کونی تر و بەرهەمی ئەم کردەوانە بـــاس ئەکری •

**ا ـ کردەوەی کار بەدەستی ـ**

ولاتی کوردستان لە میژوی کون ناو ئاخنی پیش کەوتن بووە وە مروڤ لەم خاکەدا پیش هەمو جیگایکی تر پەیدا بووە وە هەولیر کە کوترین شاری روی زەمینە ناوچەی کارخانەی شت دورست کردن بووە تـــا ســـالی ١٩٣٠ دەست گاهی کارە بەدەستی کون وە بەرهەمی ئەم کارانە پیوستی دانشتوانی شار وەلادی هەولیری بەجی گەیاندووە و ئابوری ئەم ولاتە بەم شیوەیە سەر بەخو بووە وخوی بە خوی ژیاندووە و زور کەم شت لە دەروە بوی هاتووە• ئاستگەر

هەمو کارو باری جوت وە دورینە ودەرگـــا وپـــەنجرە خانویـــــان دورستکردوە لە گەل زور شتی تر •

بە داری خو ولاتی هەمە چیزە کاروباری خانوی کراوە لە گەل کارگەی

جوت وه هەمشیه تەختی نوستن وه کرس میز دولاب صندوق وگەلی شتی تر ئەم دارتاشەنەی بازاری هەولیر بە دار وه بزمار خوی ولاتی کاریان کردووه•

ومزگەر ــ مەنجل ــ قاپ ــ سینی ــ تەشت ــ مەسینه پەقرەچ ــ پارزونگ ــ کەوچك ئەم بابتە شتانەی دورست کردوه •

تنەکەچی ــ

مەسینه ــ قودیله چرا و گەلی‌شتی تری کردوه •

قوندرەچی

دوکانەکەی گەلی جار دو دوکان بوه یکیان وەك گارگە بووه دوهەمیان بو فروشتنی ئەم کردە بە دەستانه بووه هەمو چەشن پیلاویان دورست ئەکرد• وەك قوندره وەجزمه ــ وه کالك ــ وه کەلاش ــ پوتین وه ئەم پیلاونە لـــە پیستی دەباغ کراوی خو ولاتی ئەکرا •

وه سەراج

ئەم وەستایانە ــ زینی ــ اسپ ــ وەقایش جەلەو بو ولاغی تر وه کیفی دەبانجــه وشــەش ئاگر فیشك دان خەریطەی فیشکی تفنگیــان دورســت ئەکرد وجار بە جار جاتتای پاره وه جاتتای جلو بەرگیان دورست ئەکرد که بە باول ناو ئەدرا ، ئەم بەرهەمانە دەست کردوی خویان بووه بــــە پیستی دەباغ کراوی خوی ولاتی جی‌بەجی ئەکرا •

خەنجەرچی ــ

وه چاخام سازــ کەسانی وابو هەردو کاری ئەکرد وکار بە دەستی تری بو تەنها لەم ایشە لە یکیان زانا بو ــ خەنجەرچی ــ خەنجەری دورســـت ئەکرد گەلیکیان گەلی چەشنەچەقوی قصاب چەقوی مالانیان دورست ئەکرد•

**چاخماغ ساز** ــ

فیشەگی بە تالی تفنگو دەبانچەیان بە بارود دائەگرتە وە وهەروهــا تفنگی تیك چویان چاك ئەکردوە •

**وزور کاری تر بو ــ وەك گارگەچی**

کە لباد ــ گەپەنك وە قاپوتی لبادیان ساز ئەکرد پەرەچی تەنها پــەمو وەیا خوری پەرە ئەکرد و زوریان وابووە لیفە وە دوشکی دورســت ئەکرد ، خمچی بووە•وە پەلان درو (کە کورتانی ئیستر گودریژی ئەکرد) نالبندچی ــ کاری یکەم نال کردنی وەلاغ وە سمی وەلاغی ئەتاشی ئەمجا نالی ئەکرد (ئەم نالانە ) ئاسنگەری شار دورستیان ئەکرد هەروها نالبندی کون وەك بەیتال لە نەخوش وە تەندروستی وەلاغ شارەزا بوون •

**دەلاك سەر**

تاشی ئەکرد وەختەنەی منالی ئەکرد وە زور برینی تــەداوی ئەکرد ــ وە پسپوری وا هەبو کە شکەستیان ئەگرتەوە ( ئەم کارە تــا ئیستە ماووە ، لە مالان ژن بە تەون مافور وە بەرەی دورســت ئەکرد وە جــاجم ، بەرمالی نویژ دورست ئەکرا لە ریسی خوری لە دەزوی پــەمو (دوگــرت ) ئەکرا کە لە جیاتی بطانیە لە هاوین بە کار ئەهات •

مافور لە گوندکان ئەکرا ئەما دورست کردنی دوگرتی پەمو تەنها لــە کردوەی دانشتوانی عەنکاوە بو •

وە لە لاین کورەچی ــ گوسکە مەسینە کوپەی ئاو بقبقە وە شەربەی ئاو لە قور دورست ئەکرا سەرەتای خشتی سور ( کەرپوچ ) •

لەم باسە وا دەرئەکەویت کە بازاری هەولیر تەنها جیگای کرین فروشتن

نەیو گەلی گوشەی بازار وە دوکانەکانی وەك گارگە وەکار خانەی شت دورست کردن بو .

ئەم بازرە گەوریە بیجگە ئەم کارگانە دوکانی فروشنی ئەم شتانە هەمو کرین فروشتن وەپی ویستی‌تری ژیانی تیا بو ـ وەك بقال ـ عەتار ـ بەزاز (کوتال فروش) سەبزەچی ـ قصاب .

ئەم بەرهەمانەی کە کردەی دەست بو هەندی کار بە تەواوی بزر بووە وکردوەی تر هەندیکی بە شیوەیکی تازە گوراوە هەندی شتی‌تر بەرو نەمانە. لەم چیروکە وا دەر ئەکەوی کە ئابوری کونی هەولیر سەر بەست وسەر بەخو بووە وە پالی‌داوەتە بەرهەمی خو ولاتی ، زور کەم شت‌لە لاوە هینراوە بو ئەم شارە بو پیوستی دانشتوانی .

**ب ـ کرین وە فروستن :**

لە بەندی رابوردو بومان روشنا بو کە بازاری هەولیر هەر گەورە بووە وە هەمو رەنگە پی‌ویستی ژیانی تیا پیا ئەبو ـ خاوەن دوکان زور شتیان لە لادی ئەکری شتی تریان لە خاوەن مالات ئەکری ویا لە کوچەرایاتی وە بە قازانجیکی کەم شتیان ئەفروشت .

وە دوکاندار کەمیان دوکانکە هی خویان بووە گە لیکیان دوکانیان بە مانگانە ئەو سالانە لە خاوەنی بە کری ئەیان گرت وە پیش سالی ۱۹۳۰ مانگانەی دوکان لە سی‌چوار روپیە زیاتر نەبووە ئەی لە نیو دینار کەمتر . وە هەندی کەلو پەل وەچەند پیوستیکی مال یا ژیان کە لە ولاتی هەولیر نەبو بە کاروانی ولاغ لە موصل وبغداد ، حلب ـ دیار بکر ـ نصیبین ـ ئەهینرانە وە درگایی تر بوهاوردانی شت بو هەولیر بە کاروانی لە شنو وە صابلاغ وە

اورمیه و تبریز ئەهات وەك سەماوار ــ پیاله ــ قوری چای ــ مافورــوەچك و زور شتی تر •

شاری هەولیر جیگای هل کەوتوبووە لە سەر چەند ریگایك بەم بونەیە هەر دەم کاروانی لایەدەش لەم شارە رائەبورد بو شارەکانی تر •

زور جار گەروکی بیگانە میژو نوسەر سەریان داوە لەم شارە بە ریبواری ئەو ویستویانە کە هەوالی کومە لایتی وە میژوی تی بگەن •

وزور لەم نوسەرانە باس گرنگی وە گەورەی وە پوختەیی ئەم بــازرە ئاوە دانەیان کردوە • بەبی گومان ئەم تەرزە کومەلایتی وە ژیانی ریك وە ئەم بەرهەمو کردەوی کار خانەی کردنی گەلی شت بە دەست تیکرا لەم نیشانانە وا دەر ئەکەویت کە ولاتی هەولیر لە میژوی کون پیش کەوتو بووە ، زانستی تیا گەش بووە ، وە پەرەی سەندوە لە هەمو جیهان وە ئەم شارە ناوی داوە•

ج ــ لە بەند وئەستونەدەکانی پیشوی ئەم وتارە چەند چەشن کــارو فەرمانی دانشتوانی شار گوندەکان لە سەر روالەی شیوەی کون بیژرا،ئەگەر سەیری کومەلایتی کون بکری بە چاویکی ورد چەند چەشنە کاری تر بووە لەم شارە وەك دار فروش وە حمال وە کریکا رووە وستای خانو وە کاریزچی ( کریکاری خانو نزیکەی سی مانگی زستان هیچ ایشان نە ئەکرد ) وخاوەن ئیش تریش وەك دنگچی ــ خانچی ــ چایچی ــ کاروانچی ــ نانــەوا ــ گامیشەوان حوشتروان • شوین هەل گر ...

وەکەسانی تر کە بە موچە بو میری کاریان ئەکرد ، یا شارستانی ئەو بە پاسەوانی وهی تر وەك پولیس ئەمانەش پیش سالی ١٩٣٠ ژمارەی گشتیان لە شار لە (٥٠٠) کەس کەمتر بووە •

## ٥ ــ مالات بە خێوی کردن :

بە خێوی کردنی مەر وە بزن وە رەشە وڵاغ کارێکی زور کونە لە شار وە پەلەکانی ولاتی هەولێر وە دانشتوانی گوندەکانی ــ ئــەم کارە کوچەری ناوچەی هەولێر وە جی نشینانی شار وەدی هەر دولا هوگری ئەم کارە بون٠

مەر بەخێوی کردن پارچە ــ پارچە بووە بە ( می گەل ) ناو ئەدرا هــەر می گەلی لە ٢٠٠ سەر تا هەزار سەر ژمارەی مەر وەبزنی بووە ٠

وە ژمارەی کشتی مالات مەر وە بزن وە رشە ولاغ لە گــەل بــەرزە ولاغ لە ناوچەی هەولێر گەلی زور بو ئەتوانین مەزەندەی بکەین کــە نزیك ملیونیك ئەبو ٠ وبەرهەمی ئەم ماڵاتە زور بو وەك ماستــ وەپەنیر وە رون وە گوشت ــ وە خوری ــ وە پیستە ــ وەمو ــ ریخولە وەبەرخە نیر ــوە لەم بەرهەمان زور بابەتی بوفروشتن بە ریگای موصل ئەنیرا بو حلب وەیــا جیگای تر وەك خوری وە پیستە ــ وە ریخولە ( رون بەرخ ئەنیرا بو بغدا) ٠

شایانی باسە دانشتوانی شار و دیهاتی پیش (٥٠) سال کەمتر هیچ کەس رونی گیای بەکار نەئەهینا تەنها رونی مەر وە بزن بە کار ئەهــات بو شــیو دورست کردن ، لە مالان تا سالی ١٩٥٨ هەر ئەم رونەیان بەکار ئەهینا ٠

بیجگە ئەمە گوشتی گا وە مانگا پەسەند نەبو وە زور کەم بەکار ئەهات لە شار پیش سالی ١٩٣٠ تەنها خەلکەکە ئالودەی گوشتی مــەر بون وە لــە بازاری هەولێر زور کەم گوشتی گا وە بزن ئەفروشرا وبەرهەمی تــر ماوەی شەش مانگ لە بازار پیائەبو وەك ماست ــ پەنیر ــ کــەری ( فەریکەرون ) لور ــ وە پایزان پەنیری ژاژی ئەهاتە بــازار ٠ لە دیهــاتی وهــەر دیسان

کوچەرکان هەمیشە زور تەرحە زندەی تر یان بەخیو ئەکرد وەك ئەسب ـ ماین ـ ئیستر ـ گودریژ ـ گامیش بەخیو کردنی ئەم مالاتە زور پیویست بو بو کاروانی وە سواری وە بار • لە گەلی مالی ناو شار وە لە هەمو گوندەکان چەند چەشنە تەیر توال بە خیوی ئەکرا وەك مریشك ـ قاز مراوی ـ علی شیشی کوتر ـ وە ئەم بەرهەمە بەشی پیویستی شار وە لادی ئەکرد هیچ پیوست نەبو هیلکە ویا گوشتی مریشك لە جیگای تروە بو ولاتی هەولیر بیت تا سالی ١٩٥٨ بەم جورە بووە •

تەنها لە زستان وە پایز پاش باران پەلە بەکار هینانی گوشتی مریشك پەسەند بو بە هیچ جوری لە کاتی کە مریشك ـ قاز •• کە جوجەلەیان هل ئەهینا ئەی لەکاتی کورك بونی لە بهار وە هاوین گوشت مریشك بە کار نەئەهینرا ـ وە لە هاوین زور کەم هیلکە ئەخورا •

## تەندروستی ولاغ :

کوردەواری بە چاویکی تەواو چاویان لەهەمو پیوستی مالات بو هەروها لەسەرما مەر وە بزن لە دەشت لە غالی بەرد دا ئەکرا و لەگوندانی چیا لە ئەشکەوت ئەو لە خانو لە کاتی بەفر ئە پاریزرا • ئیتر اسب وەرشە ولاغ لە تەویلەی ریکو پاك بەخیوی ئەکرا ، وخاون مالات وە ولاغ هەردەم ئالیك وە لەوەری ئەم زندە ومالاتەی بەر چاو ئەکرد سەر باری ئەم شتانە تەندروستی زندەور ئەگەر مەر بی ویا بزن ویا بەرزە ولاغ بو هەر نەخوشیك دەرمانانی تایبەتی بو ومروڤی پسپوری زانای ئەم کارە هەر بوون لە دیهات پیش بونی بەیتالخانە وە ولاغە بەرزەی وەك ئەسب ئیستر نالـند لە شار لە جیاتی بەیتال ئیستە کاری تەندروستی ولاغی ئەبینی •

**مەر وە بزن گەلی**

سالی هەندیکی لە سـالی زورسەرما وەسەخت ئەفەوتا ئەگەر جیگاو ریگای تەواو نەبوایە ، هەروەها سالی نەهاتی ( بی باران ) ئەم مالاتـە زور زیادی نەئەکرد وزور کەمی ئاووس ئەبو لە بەر بی هیزی وەلە نەبونی پوش، پەلاش پەریز وە پاوانی تەواو بو بە خیوی کردنی ، هەر سالی بی باران کارە ساتیک گەورە بو بو ئەم بەستە زمانانە •

**بە خیو کەری** مەر وەبزن هەندی کەرت خاوەنی بووە وهەندی جاریش شارستانی لە گەل لادی بە هاو بەش مەریان بە خیو ئەکەرد بە شیوەیکی تایبەتی کە بی ئەوترا لیکدان دوبەش مالاتی شارستانی بە شیك مالاتی لادی لیك ئـەدرا وخەرجی بە خیو کردنی میگەلەکە هەندی شتی لە سەر شوان ئەبو وهەندی خەرجی تر لە بەرهەمی مالات دەر ئەجو ئەم لیك دانە بو ماوەی حەوت سال ئەبو وە هەمو بەرهەمی سال بە سال بەش ئەکرا بە دو بەش هەر بەشی بویکی لەمانە وە پاش تواو بونی حەوت سالە سەرو بەری میگەلەکە ئەی گشتی مەر وبزنکە ئەکرا بە دو لەت هەر بەشیکی ئەدرا بەلایکیان • چەشنی تر بوبویە خیو کردنی مەرو بزن خاون میگەل کە شارستانی ئەبو وە شوانەکـە لادی ئەبو ئەم شوانکاریە ئەم میگەلەی بە خیو ئەکرد وبەرهەمی رونـ وە خوری وماست وە پەنیر ئەکرا دو بەش هەر بەشیك بو لایکیان بەلام بەرخە نیر تەنها بو خاوەن میگەل بو وەبەرخی می لە گـەل میگـەل لیك ئـەدرا بو ئەوەی سال دوای سال ژمارەی زیاد بکری• ئەم بەش داریە بە (دو خور) ناو ئەبرا•

**٦ ـ ئابوری :**

لەم وتارە بو خویندواران وا دەر ئەکەوی کـە دانشـتوانی شـار وە

دیهاتی وه پەلەکانی ناوچەی هەولیر پیوستەکانی ژیـان وەك جلو بەرگ ـ خواردەمەنی ناومالـ رایخ وه کار وباری جوت وه خـانو کـردنی ئـەم پیوستانه له بەر هەمی کشتوکال ـ وه مالات به خیو کـردن وشـتیتر که بەرهەمی کارخانەی دەست بووه ئەم پیوستانه هی خو ولاتی بووه زور کەم شت بووه که له جیگای تر بو ئەم ولاته هینراوه •

وگەلی چەشـنی ئـەم بەرهەمـە وەك گـەنم ـ جو ـ بـەرخ ـ خوری پیسـتە ـ ریخولـه ـ مو ـ وه رون ـ پـەنیر نـیرراو بـو ولاتی تر ، ئـەم تـەرزه ئابوریه سـەنگی گرانـه که ولاتی له توانای بی بەبەرهمی ناو خوی پیوستی رنگاو رەنگی ژیان جیبەجی بکات وئەم روالەیه سەر مایەکی تەواو وه پزشیکی روشنایه که ئەم شاره ناوەخنی زانستی وه پیش کەوتن بووه له میژوی کون به هونەرمەندی دانشتوانی •

# ( بەش پینجەم )

## کشتوکال بە شیوەی کونی لە هەولیر

دانشتوانی هەولیر هەمە چەشن کار وباریان بووە بە شـــیوەیك کـــە کە پی‌ویستی ژیانیان بو ، خەلکی شار وەلادیکانی بە تەواوی وە دورســـتی ئامەدە کردوە و ئەتوانین بلین بەرهەمی خو ولاتی لە توانـــــای بووە خوی بەخوی بەش بەریوە چونی وە ژیانی نشتمانی شار وگوندەکان بکات ئـــەی بەرهەمی زورشت لە پیوست زیاتر بووە وە لە بەرئەمە ئابوری ولاتی هەولیر سەنگو تەرازو زور تەواو بووە •

شارستانی هەولیر وەدانشتوانی گوندەکانی گەلی چەشن کاریان بووە وەك کاری دەست ( شت دورست کردنەوە ) بەخیو کردنی مالات وەك مـــەر وەبزن وە رەشە ولاغ وکرین فروشتن وزور کردەوەی تر سەرەتای هـــــەمو کاریك کشتوکال بووە لەم ناوچیە گرنگ ترین بەرهەمی وەلات بووە وە لـــەم وتارە باسمان دەربارەی کشتوکالە وبەرهەمی ـــکارو باری وشیوەی چاندنی وەبەناو هینانی کشتوکال بە دەستوری کونی ، بەرەو (٥٠) ســـال تا ئیستە وردە وردە لە گورانە وئەتوانین بلین کە شیوەی کونی کشتوکال بە تەواوی گوراوە ولیرە ئەمانەوی زانستیکی تەواو پیش کەش خویندەواران بکـــەین لە بابەت کشتوکالی کون کە باس ئەم شتە بەبی گومان لە دەفتری میـــژوی کورد ئەبی بنوسری •

**١ ــ میژوی کشتوکال ــ**

له میژوی کونی هەولیر وه بەجی ماوەی مروی کونی وا دەرئەکه ویت که کشتوکال له ناوچەی هەولیر دەست پی کردنی ئەگەریتەوه هەزارها سال پیش نوسینی میژو •

وبەرهەمی کشتوکال ( وەك گەنم وجو ) ئەستندویکی گرنگی ژمان وئابوری ئەم شاره بووه •

زوربەی بنەمالانی هەولیر کارو بەرهەمیان کشتوکال بووه وئەم کاره به دەستوریکی تایبەتی هل سوراوه وکراووه که ئیستە بەتەواوی گوراوه وەمافی به شیوەی کونی نەماووه وزور شتی له بیرچویتەوه وئەم زانستە وکردوه کونه ئەگەر لەسەر کاغد نەنوسری کەس له دواروژ پاش ماوەیکی کەم نازانی ئەم کاره چلون بووه وچون کراووه خوم به بەختیار ئەزانم چیم دیوه وچی ئەزانم وچیم لەیاد ماوه لەم وتاره بی نوسمەوه بەلکو دوا روژ سودیکی بەنرخی ببیت •

**٢ ــ شارستانی هەولیر خاوەن زەوی :**

ئەم خاوەن زەویانه گەلیکیان لەقەلای هەولیر ئەژیان وەزوی زوریان له دەوروپشتی شاربو وله چەرخی ( ١٨ ) زاینی ئەم زەویانه به ناوی خاوەنی لەلایان دەست به کارانی عثمانلی با تاپو به ناویان نوسرابو وهەر گوشیك له خاکی ناوبراو که کشتوکال تیا ئەکرا ژمارەیکی تایبەتی هەبو وله تاپو به (٣)س بەشی دانرا بو وئەم خاکه گشتی به وارش شاری هەولیر ناو ئەبرا وژمارەی ٤٤ــ٤٥ــ٤٦ بو وئەم ژمارەیه تا ئیستە بەکار دیت هەرچەند له

نیوەی زیاتر لەم زەویانە ئیستە خانو وەبەرەی شـاری تیا دورست کراوە • وەهەر پارچەیەك لەم وارشە دابەشی ژمارەیکی زور لـە زەوی کرابو وهـەر زەویك ناو وژمارەی تایبەتی بو وەهەریکی بە نـاو خاوەنی خوی نوسـرابو وەئەندازەی ئەم زەویانە بە دونم ژمارەی ئەکرا هەنـدی زەوی ئەنـدازەی گەورەبو بەلکو ئەگیشتە ٨٠٠ــ٩٠٠ دونم ویازیاتر وپارچەی بچوکیشی بو کەئەندازەی ٢٥ دونم ویا کەمتربوو • وەهەردونمیك جیگای ٢٥٠٠م٢ وهـەر دونمی جیگای توی یك قسەسناغ گەنمـە ( ئـەی دوتەنکە گەنم ) ئەو بە کیشانە ١٦ کیلو گەنم •

(١٠٠) صەد مال زیاتر لە دانشتوانی شـار خـاون زوی وزار بوون وە گەلیکیان کشتوکالیان لە وارش شار بو ولە ناو شار نزیکـەی (٢٥٠) جوت ئیستر خەریکی کیلانی ئەم زەویان بوون وهەندی لە هەولیریەکان کشتوکالیان لە دیهاتی نزیکی شار بو کە بە (دوروبار) ناو ئەبرا ولە سەدەی دواتر هەندی شارستان لەناوچەی بەرانی وقوشتەپە وشـمامك وبشتـری بونە خـاوەنی دیهات•

وخاوەن ئەم دیهاتانە گەلکیان مالیان لە ناو شاربو ولە جیاتی ئـەوانە کویخای گوند ویا سەرکار کاروائیش گوندی هەل ئەسـوراند لە جیـاتی خاوەنی •

وە خاوەنی ئەم دیهاتە چەند زەویك لە لایـان جوتی خویـان ئەکیلرا وەپارچەکانی تر دابەش سەر جی‌نشین گوند ئەکرا کە بەفلاح ناو ئەبرا ــ وە ئەم فلاحە دە یك وەیا هەشت یکی بەرهەمی ئەدا بە خاوەن دی •

٣ ـ **ئەما ئەوانەی کاروباری** کشتوکالیان ئەکرد جوتیاریان پی ئەوترا ـ وە ئەمانە جوتیان بە ئیستر ویا گا ئەکردە وئەم جوتیارە بەبریە ئەگیرا هەتا جوت تەواو ئەبو وکریکەی بەشەرت ناو ئەبرا وئەم شەرتە چەند عەلبە گەنم وجو بو لەگەل ـ پارە ـ لەگەل دو جوت پیلاو وەسوتەمەنی وە خانوی هەروها پی ئەدرا .

ئەی ئەم جوتیارە کە لەلایان خاون زەوی یا فلاح ئەگیرا بو ماوەی نزیك حەوت مانگ لە سەرتای پایز تا ناوە راستی بهار کریکەی بـە بریـە بو بو ئەم چەند مانگە .

وپاش فەرەك بونی گەنم وجو ئەی پی گەیشتن لە لایان سەپان ئەم بـەر هەمە بە ناو ئەهات ئەی کە دەغل پی ئەگەیی روژی چوارشـەمە یك دو کەس ئەچونە سەر زەویك ـ چەند سوالە جو ویا گەنمیان ئەدوری وادیـارە ئەم پیش دەستە بە نیازی بەرکەت ئەکرا وە بە ( سونەت ) ناو ئەبرا .

وە پاش یك دو روژ دەست بە دورینەی جو ئەکرا ولە تەواو بونی پاش چەند روژ حەسانەوە دەست بە درەوی گەنم ئەکرا وە درەوی دەغل لە لایان سەپان بە چاوە دیری سەرکار ئەکرا ویا خاوەن کشتوکال .

ئەما فلاح بچوك کە زور جاری جوتی ئەبو وە ئەم جوتـە بە گودریـژ ئەکرا لە جیاتی ئیستر ، ئەمانە گەلیکیان خویان وە مالو منالیان وە خیزانیـان دورینە و کارو باری تریان ئەکرد تا خەلەکەیان بە تەواوی بەناو ئەهینا .

٤ ـ **خاوەنی کشتوکالی گەورە کە**

بە چەند جوت ئیستر زەویکی زوری ئەکیلا وە توی ئەکرد دورینەی ئەم ئەم کسانە شیوەکەی فولکلوری نشتمانی ئەم وەلاتەی پشیان ئەدا .

سەپانەکان بەریز یك لە پال یك هەر کـەس داسیکی بە دەست گرتوە ویکەم کەس کەدروی ئەگیرا سەر پالەی پی ئەوترا دەنگی ئەکرد سـەپان دەستیان بە دروینە ئەکرد لەگل ئاوازی گورانیانـ پشتیان کوم ئەکردوە لەو سەرەی زەوی تا ئەو سەر بە دوای دورینەکە بە یك گاز ئەرویشتن تا سـەر پالە سەری بلند ئەکرد پاش هەناسیکی کورت دو بـارە لەم سـەرەی تری زەوی بو لای تر گازیکی تر ئەچونە پیش ئەوە .

وە بەم جورە زەوی بە زەوی پارچە پارچە دەغل ئەدورایەوە .
سەپان دەستی چەند ئەی گرت لە دەغل پاش دورینی سوالە لە سەر سوالە بـەجی ئەهیشـت ئەمجـا کیژولـە کـچ کـە پیـان ئـەوترا گیشەکەر ئەمانە سوالە بە سوالە لە عەردوە ئەو لە دەستی سەپان وەریان ئەگرت ئەیان کردە کومەل لە ناو زەوی وئەم کومەلانە بە گیشە ناو ئەبرا .

لە کاتی درەو سەپانەکان گورانی خوشیان ئەوت لە هەر گازی لە درەو ئەم جورە گوارانیانە هەمە رەنگ بوون هەندیکی تەنها لە کاتی دروینە بە کار ئەهات گوارانی تر مەبەستی بە خوشەویستی وە دلداری بو ویا بە شانو بالای پیاوی گەورە وناودار ئەوترا وە یا بو یاباس پیاوی ئازاو قارەمان بو .

وە شایانی وەتنە لە کاتی دورینە ئەگەر پیاویکی گەورە چوبایە سەیری دورینە وەك شاباش شایی ئەبو شتیك بداتە سەپانەکان وئەم کردوەیە بە سوالە هەل گرتن ناو ئەبرا .

سەپان لە سەر ایشوکاری خوی ئەما تـا دەغل بە تەواوی ئـەدروایەوە وەئەکوترا بە جەنجەر وشەنە با ئەکرا بو ئەوەی کا لە دان جیا ببتەوە امجـا دەغل ئەگوزرایەوە عەنبار ئەو ژوری حەسار وەکا ئەخرا ناو کادان ئەمو لەودە

ویا ژور ویا چاڵ • سەپان ٥/١ پینج یەکی بەرهەمی جوی بو وە ٦/١ شەش یەکی گەنم ئەم پشکە لە بەینی سەپانەکان دابەش ئەکراوە گیشەکەر ( وە جەنجرەوان ) کە زور دەم منالی سەپانەکان بون ئەمانە کری خویان لە خاوەن کشتوکاڵ وەرئەگرت وە ئەوانەی قرشەی دەغالیان لە زەوی ئەگوازتەوە بوسەر جوخین پیان ئەوترا ( شەغرەکیش ) وەکری ئەمانەش بەروژانە بو زور جار لەسەر خاوەن ماڵ بوو •

## ٥ ـ نیرو نیری زەوی وەکیلانی :ـ

هەر خاوەن زەویك گەلی جار زەویەکانی ئەکردە ٣ س بەش بەشیکی بەبور ئەماوە وئەگەر ئەم بورە سالیکی تریش بەبی کیلان بەجی بما بایە بەیاریان پی ئەوت وە مەبەست لە بەجی هیشتنی زەوی یك دوساڵ بو ئەوە بو تا هیزی زەوی زیاد بکات وبودوا ساڵ بەرهەمی زور بی ـ ئەم کارە ئیستە نەماوە لەبەر ئەوەی زەوی زور جار هەرساڵ ئەکیلری •

وبەش تری زەوی ئەکرا بە شو وپی‌ویست بو ئەم شویە لە کانگای سەرما بکری ئەی لە کاتی شەختە بەستن لە روژانە ساردی زمسان بو ئەوەی کە کرم ـ ومشك بفوتی وگیا وگولی تیا نەروی وەنەمینی بو سالی ئاینده•

وئەم شویە لە بهار دو بارە ئەکیلرا وئەم کیلگە دوەمە بە وەرد ناو ئەبرا وە سالی تازە لە گل دەست پی کردنی پایز دەست بە تو چاندن ئەکرا وئەم تویە بە کیلگەیکی جوت دائەپوشرا •

وئەمانەی تویان پیوە ئەکرد بە ( تودەر ) ناو ئەبران ئەم کارە هەرکەس بە تەواوی وە بەپوختەیی شارەزای نەبو وەپی ویستبو تودەر زانابی بو

ئەوەی کە تو هەل ئەدات بە شیوەیکی ناوەنجی بی بو ئەوەی تو زور تـەنك ویا بور نەبی ، ئەگەر تەنك بی بەرهەمی زەوی کەم ئەبی و ئەگەر تو بور بی دیسان برشتی کەم ئەبیتەوە •

و هەروها توی تەنك گەلی جار کشتوکال توش گیاو گولی ئەکات وەزیان بە دەغل ئەهینی وەتوی قایدە ئەبینە ماوەی باش بو نی دەغلەکە •

## ٦ ـ جوت چلون ئەکرا :

ولەچی کارو باریە پیك ئەهات ئەمباسە چیروکی تایبەتی هیـە گەنجی ئیستە زوریان هیچی لی نازانن ــ هەروەك لەسەرەتای ئەم باسە میژرا جوت بەدو ئیستر ویا گا ئەوگودریژ ئەکرا ولە بەینی هەردو ولاغەکە داریکی چەماو ئەبەسترا پییان ئەوت ( هەوجار ) ئەوەی لەکاتی پایز بەکار ئەهات ئەبا سوك بی لە دار بی ویا بەرو دورســت کراوبو وبو زســتان لەبــەر قوری زەوی هەوجاری بەتین بەکار ئەهینرا کە ئەمش لەدار گویز دورست کرابو زور جار هەوجار ئەشکا ئەگە کەلکی پیا بمابایە ئەنیرا بو نجار کە چـاکی بکـات وئەگەر زور بی کەلك بوایە لەکار ئەکەوت لەبەر ئەمە خاون کشتوکال هەوجار وزور کاروباری تری زیادە لە پیوست هەردەمی بوی بوئەوە هەر پارچەیك لەچوت شکا ویا لەکار کەوت کەدەست بەجی ئەوشتە بگوری تا ایشو کاری رانەوەستی وئەم هەوجارە لەگە (بن مل) ( کە لە لباد وە کەونە بەرە دورست ئەکرا) ولەگەل گوپەلانی دار ئەخرایە ملی ئیسترکان وەلای دوەمی هەوجارکە چەماو بو ئاسینکی لی ئەبەسترا ئەو لە داری هەوجار تی ئەخرا بە ( گاســن) ناو ئەبرا وئەم کار گەیە لە گل هەوجار ئەبووە یك پارچە امجا هەوجار بــە

داریکی تر ئەبەسترا بەملی ئیستر بە هەوەی بن‌ملو گوپەلانەکە وەئەم دارە بە
( مژان ) ناو ئەبرا بەلەلای خوارەوەی هەوجار داریکی‌راستی تر بو کــە بەئە
( آستندوو ) اناو ئەبرا وەجوتیــار ئەم ئەستندووەی بەدەســتیکی ئەگــرت
وبەدەستی تری داریکی هەل ئەگرت بوئەومی ولاغەکانی لی خوری وەئــەم
دارەش وەك گوچانیك بو بەلام هەردولای راست بو وەلە دار بەرو دورست
ئەکرا وبە دار جوت وەیا بە داری جوتیاریان پی‌ئەوت •

هەروها جوتیك کەپی ئەوترا جوت لەم چەند کارو بارە ریك ئەخرا•

وەزوی بەم کارگەیە ئەی بەم جوتە ئەکیلرا بوچاندنی دەغلی زســتان
وەك‌گەنم وجو وهەر کیلانیکی‌تر بو چافــدنی شــینای وەبستان ئەگــەر
کشتوکالی زســتان ویــا هاوین‌بایە هــەر بــە جوت زەوی ئــەکیلرا بو
نەمام چاندن ئەی جوت بوهەمو کاریکی کشتوکال بەکار ئەهینرا هەتا باغچە
بستانا دار وەمیوەجات ئاوی وەدیم سالی‌جاری بەجوت ئەکیلرا •

ودەستوری کیلان لەزوی گــەورە کەئەنــدازەی فرەوان بو وزوەی
خاون کشتوکالی زور گەورە بو دەستوری تایبەتی بو وئــەم کیلانە کــە
بەچەند جوتیك ئەکرا برا گەورەی جوتیاران زەوی دابەش ئەکرد بەچەند جی
وئەم کردویە ( بەلات برین ) ناو ئەهیزا وپاشتر جوتیاران دەست بە کیلانیــان
ئەکرد وئەم کردوەیە لەکاتی شوبرین وەوەردانەوە وەتوکردن هەمــان کردوە
لەهەر سی گاسن بە هەمان شیوە جی بەجی ئەکرا •

## ٧ ــ کوتانی دەغل

وکیشانەوی بو ئاوای ــ دەغل ئەی گەنم وەجو لە مانگی‌نسیان ئەبووە
فەریك ، لە ناوەراستی مانگی مایس گولی خەلە بەتەواوی پی ئەگەیشـــت
هەروەك باس کرا سەپان بە داس ئەی دوریەوە وەداسەکە بە دەستیکی ئەبو

وەدستی تر دەست کیشکی ئەخستە دەستی کە سوالەی دەغلی ئەدوری تـــا پەنجەکانی دەستی بریندار نەبی وئەم دەستکیشە بە (قەنیاغ) ناو ئەبرا هەر وەها سەپان کلاویکی لبادی لە کاتی دورینە ئەخستە ســـەری هـــەروەك (شەبقەی) ئیستە بو وئەم کلاوە سەرو گیانی لە تەوشمی روژ وگەرمایی ئە پاریزت ، سەپان بە داس دورینەی ئەکرد وگیشەکەری کچ کوی ئەکردەوە سوالەکانی ئەکردە گیشە ئەی کومەل دوای کومەل •

(وە داس ئاسینکی پولا بو سەریکی چەماوو تیژ بو) جـــار بەجـــار بەردیکی تایبەتی کە ناوی (هەسان) بو ئەم داسە بەهەسان تیژ ئەکرا پاش چەور کردنی وەلای دوهەمی داس دەسکەی لە دار ئەکرا بو ئەوەی ســـەپان بە ئاسودەیی بە کاری بهینی بە ساتای لە گەرمای هاوین بە کار بیت •

وپاش تەواو بونی درو وکوبونەوەی قرشەی دەغل لەناوزەوی بەولاغ ئەم قرشەیە ئەگوزرایەوە ئاوای بو جی جوخینان ولە هەر گوندی ـــ ولـــە شاری هەولیر لە چەند جیگا گورەپانی تایبەتی بو کە تەنها بو جیگای جوخین دەغل تەرخان کرابو (وزور جار لە نزیك ویالە قەراغ ئەم گورەپانە جیگای چەند قسناغ جو ئەکرا بە قەرسیل بو روەلاندنی ئیستر وەولاغی تر بوماوەی نزیك مانگی باش تەواو بونی جوت تا دورینە دەستی پی ئەکرا) •

وقرەشە لە زەوی بو جیگای جوخین بە ولاغ ئەهینرا وئـــەم ولاغـــە (شەغریکی ئەخرا سەری) (اوئەم شـــغرەیە لـــە دار دورســـت کرابو وەك پەیژەیکی دولایی ئەخرا رسەر کورتان ئیستر وەقرشەی دەغلی لی توند ئەکرا ولە زەوی ئەگوزرایەوە سەر جوخینان بەم شیوەیە) •

وئەم قرشەیە جیبەجی کو ئەکراوە وەکو ئەکرا ، بە جوخین نـــاو ئەبرا وەلە ناوە راستی هەریك لەم جوخینانە داریکی ئەسپینداری راست ئەچەقـــا

وئەم دار چوخینە جەنجەری لی ئەبەسترا ولە دوەری ئەسوارا •

وپاش ئەوە کە جوخین ریك ئەخرا وقرەشەکیشانی تواو ئـەبو هـەر جوخین تەنها یك دوای یك بە وولاغ گیرە ئەکرا بوئەوی قرەشەکە پان بکات وبی شیلی وەبو کوتان ئامادە بکری •

وپاش ئەمئیشە دەست بەخەلە کوتینەوە ئەکرا بەجەنجەر کە بـەولاغ رائەکیشرا • وئەم جەنجەرە بەگوریسیك ئەبەسترا بەدار جوخین وجەنجەروان سواری جەنجەر ئەبو وهەلی ئەسوران بەدەوری جوخین بەپی سـوـرانی ولاغەکە وەئەم جەنجەرە دەغلی ئەکوتی سەپانی لەدیاری ئەم کارە ئەبو کـە قرشە بداتە بەردەوی جەنجەر وەوردە بەلای تر جیای بکات بـەم دەسـتورە دەغل دو جار ئەکوترا جاری یکەم ( قرشە کوت ئەکرا ) ودوبارە سـەپانەکە جوخنەکەی گرد ئەکردوە وبەبیل وەشەنە کوی ئەکردوە وە بـە جەنجـەر ئەکوترا وکوتانی دووەم کە وردە کوتی پی ئەوترا بەم کوتینە بە تەواوی دانی دەغل لە کا جیا ئەبووە •

وئەم وردیە کە تیکەلە بو لە کاو دان بە ( شەنە ) ئـەدرا بـەر بـا ئەی بە با ئەکرا بو ئەوەی دان لە کا جیابی تەوە دان بە الایك ئەمـا وکـا ئەکەوتە دوری جوخین وەسەپان کاو دانی جیا بەجیا کوئەی ئەکردوە بـە کومەل •

وزور جار شەنە با دوا ئەکەوت لەبەر نەبونی با و لەکاتی کەبـای شەمال گزەی بکرادیە بە خەلاتیکی خدای ئەژمیرا کە ئەم بایە یارمەتی تواو کردنی ئەم ئیشوکارەی ئەکرد پیش هاتنی زستانی سالی تازە •

جوخینە گەنم وجو پاش ئەم سەینو بەینە دورو درێژە کاری کوتاهی پی ئەدرا .

وەلەو رادەیەدا نورەیی جیا کردنەوی مزەی بەش داران دەســـت پی ئەکرا کە هەر کەس بەش خوی بەپی پشکەکەی کە هەیتی پاش بەش کـردن هەر بەش بدری بە خاوەنی .

بەشی سەپانان جیا ئەکرایەوە وهەروها بەشی خاوەن زەوی لی دەرئەچو کە بەتابو ویا ملکانە ویا بە بەشی برا گەورە ناو ئەبرا .

وهەر کەس بەش خوی ئەگوازتەوە ، وە خاون خەلەی زور لــە عەنبار ویا لە ژوری حەسار وەیا لەچالی دەغل دانەکەی دائەکرد ، وەئەمانەی خاوەن بەرهەمیکی زور بوون ( بیری دەغلیان بو کەناوەکەی بەخشتی سور دورست کرابو ) وەئەم بیرانە گەنم ویا جوی تیا هەل ئەگیرا لەژیر بیر یك بست کـای تی ئەخرا ئەمجا دانەکەی تی ئەکرا پاش دان دیسان کا ئەمجا قرەشە ئــەو قەسل ئەخرا سەری وە بە قورە سور سواغ ئەکرا) ئەم تەرزە بیرە وەك سایلو بو کە دان لە گەرما بی پاریزی وبوماوەی ٣ سال ئەم دەغلــە نەگوری . ) وبیری زور باش بو ماوەی (٥) سال خەلەکە لە ناوی وەك خوی ئەمـایەوە . ئەما کا بو ئالکی ولاغ ( ئالیك ) وەیا بو قورکاری وە بومەرو مالات ئەخرا لەوەدە ( کــادان ) وەهــەندی لەودەی شـــار دیوارەکانی بــە کــەرپوچ (خشتیسورکراو) دورست ئەکرا لەودەی کای گونــدەکان بەلگبن ( لبن ــ خشتی کال ) دورست ئەکرا .

وکا ئەخرا لەودە ، قسەل ئەخرا سەری پاشتر قورە بەست ئەکرا بەشیوەی باران لەسەری رانەوەستی .

ئەما گای بەردەست ئەخرا ژور وە یا چال کە روژ بە روژ بە کار ئەهاتـ
وەلەوەدە زور کەرت لە سالیك بوسالی تر ویا زیاتر ئەما لە ترس سالی نەهات
ئەی بی باران ئەو بە ئافات •

## ٨ ـ خاوەنی گوند وەزەوی :

خاوەنی گوندەکانی ولاتی هەولیر ئەی دیهاتی دەو روبـار وە بەرانی
وشەمامك وکەندیناوە وقەراج لەم گوندانە هەندیکی خاوەنی هەولیری بوون
وهی ترگوندی ئاغای دزەی بو ویا ئاغای گەردی وهەندی گونـدی تـر
خاوەنی لەدیەکە دائەنشین ئەی هەر چەند پارجە زەوی هی فلاحی بو •

وپیش سالی١٩٣١ ئەی پیش دەرچونی یاسای تسویە لە قەراج ویا لەپشت
ری ولە شەمامك زور گوند خاوەنی دانشتوانی گونـد بوون هـەرفەلامی
خاوەنی چەند پارچە زەوی بو بەم شیوەیە ئەم گوندانە زوی هەرکـەس هی
خوی بو وکویخا دی برا گەورەی دی بوو •

ئەبی خوینەواران ئاگەداربن دەرەبەگایەتی لەشـاری هەولیر ولـە
ناوچەکەی نەبووە وپیش یاسای ناوبراو زورکەم کەس بووە لەیك وایـا دو
گوند زیاتری بی ، ئەتوانین بلین هەتا پیش هەلگیرسانی شـورش ١٤ تموز
١٩٥٨ لە هەمو خاکی کوردستان عیراق لە هەشت نو کەس زیاتر نەبووە کـە
بە نیوە دەربەگی دابنیرن وئەمانەش زوریان نشتمان پەروەر وەپیـاو چـاك
بوون وخاوەن دی یا سەروکی عەشیرەت تەنها برا گەومریك بو کارو بـاری
دیهاتەکانی هەل ئەسوراند ولەدەستوری ژیان ئەمریزە پیاوانە ماوەیکی زور

لەبەینی ئەمانە وژیانی فەلاح وجوتیار بەرچاو نەئەکرا •

وهەر دەم برایەتی وخوشەویستی وەئاسایش ویارمەتی لەبەینی دانشتوانی شار وگوند بە شیوەیکی زور جوان هونرا بوو وجیاوازی لە پلـەی ژیان زور کەم بو جلو بەرگ وەخواردەمەنی شارستانی وەلادیی وە پیاوی دەست کورت وپیاوی دەست دریژ وەدولەمەند وەرنجبەر لەسەریك رەنگو ریس بو وەلەم شتانە وا دەرئەکەویت وەلاتی هەولیر دەوری چینایەتی (طبقی) نەدیوە وەك گەلی ولاتی تر لە روژهەلات ویا روژئاوا •

زیاتر لەمە هەرکەس بەکار وکردەوەی خوی ئەگەر هــەولو تەقــەلای دابی وردە وردە چەنگ کەوتوبی وەپاری بەدەست کەوتوبو لەریزی جوتیار بوینە فلاح ولەریزی فلاح ئەگەر چەند سال بەرهەمی باش بوبی وەئــابوری خوی ریك کردبی لە توانای بووە کەزەوی بکری وردە وردە دەولەمندبی•

## ٩ ـ بەرهەمی کشتوکال لە زستان وە هاوین :

کشتوکالی زمسان ئەم چەشنە کشتوکالە یە کە لە مانگی زستان تو ئەکری وە ئەچینری وەزربەی کشتوکالی شاری هەولیر وگوندکانی دەشت لە زستان ئەچیندرا چونکی ئەم کشتوکالە لە زەوی دیم ئەکرا وە بە ئاوی باران ئەرواء گەنم وجو لە پایز دەست بە چاندنی ئەکرا هەتا دوا مانگی زســـتان ولەبهار نوك وەنیسك وە تەروزی وە گندورە (کالك) ئەم بابەتانەش بە باران ئەکران ولە سالی باران زوری لەجی ئاو گر پیاز وە باقلا بە دیم ئەکراء

گەنم وە جو لەوەرد ئەکرا ئەی نیر ونیر ئەکرا بەلام بســتان دیم وەنوك وەنسیك لە شو ئەکرا کە سالی ئاینده ئەکرا بەگەنم ویاجو •

**١٠ـ ئەما كشتوكاى هاوين ـ**

ـ ئەى بەرهەمى هاوين ويا بە شيويكى راست كشتوكالى بەر ئاو ـ •

لەدامەنى زى گەورە وەزى بچوك بەجوگە لە ئاو هەل ئەگيرا وەيا بـە ناعور ئاو ئەهەلنجا وەلەبەر ئەم بەر ئاوە سەبزە وە بستان باغ ئەچاندرا ، لـە ديهاتى دەوروپشتى شار كە بە دەو روبار ئاو بانگى ئەدرا وە لەوارش هەولير چەند كاريزى بووە بە ئاوى ئەم كاريزانە سەبزە شيناى ئەكـرا ولەبـەر هەنديكيان درختى ميوەجاتى تيا روا بو •

وئەلين لەسەدەى (١٨) زاينى وە پيشتر نزيكەى (٤٠٠) كاريز لە ولاتى هەولير بووە وە ئەم كاريزانە بەدەست كردە كراوون •

لەم كاتە داتە تەنها نزيكەى (٣٠) كاريز ماوە ئەم كاريزانە زور كەرت هەر هى خاون دى بووە وجەر بەجار خاون زەوى يكى تر بووە كشتوكالى بەر ئاوى كاريز بە شينايى ئاو براوە هەندى جار خاون كاريز زەوى بەر ئاوكە هى خوى بووە وخوى شيناى كردوە بە يارمەتى شيناى‌چى يكى پسپور كـە بە ( جەوان ) ئاو براوە ـ وئەم جهوانانە لە كارى شـيناى چـاندن وەريك خستنى زەوى زانا بوون • وەئەگەر خاوەنى زەوى كەسانى تر بوايە پشكيك لە بەرهەمى شيناى پى ئەدرا •

جارى واش بووە عەرد وئاو بەكرى دراوە ئەى بەجورەيكى تر ئـەم كارە كراووە •

لەبەر كاريز برنج ـ لوكە ـ پياز كراوە لەگـەل سەبزە وەك باقـلا طماطە ـ كودو ـ باميە ـ بانيجان لەكاتى پايز خيار ولوبيا وەتور ـ شيلم ـ چەوندەر ـ وەتور ـ وسير ولە ديهاتى پال چيا ويا بەرو شـاخ كە لە پشت‌رى هەولير هەل كەوتوە وە دوروپشتى ئاوچەى پيرمام وەبـەو

دیوی بەستورە لەم گوندانە لەگەلی دی چاوگەی ئاو کانی تیـــا بووە وە گوندی تر کە لەسەر روبار هەل کەوتووە لەم گوندانە هەر چەند گەنم وجو ونوك ونیسك بەدیم کرابی بەش دوەمی کشتوکالیان لەبەر ئاوی ئەم سەرچاوە ئاوانەی باس کراو کراوە وە ئەم سەر وچاوی ئاوانە هەندیکی ســال دواسال ئاوی لە یك نزم بوە کەم وە زیادی نەکردوە ئەما کانی ئاو وەگەلی لە روباران سالی کەم باران وە بەفر بەرەو هاوینی ئاوی ئەم چاوگانە لە کورتی بووە .

لەم دیهاتانە لە هاوین وە پایز بهار گەلی رەنگ وە بابەبت شـینای وە سەبزە کراوە وەك توتن برنج لوکە وە باغی میوەجاتی تیا چاندراوە .

وە داری میوجات وك رەزە میو ــ گویز هەنجیر ــ هەرمی ــ ســیو ــ خوخ ــ هەلوژە ــ زرەدلو ( قسیی ) کشمیش ــ تو ــ گەلاز ــ انجاز ...

بیجگە باغی ئاوی رەزە دیم لەگەلی دیهاتی چیا وپال چیا بوە وەك ئیستە وئەم میوەجاتە کە تەنها لەسەر ئاوی باران راوستاوە ( وەك باوی ــ سماق ــ تری ( رزمەمیو ) هەنجیر ــ هەرمی .. ) .

**١١ ــ وە دارستانی چیا بە بەرهم بووە**

وەك بەرو ــ قازقان ــ مازو ــ گەزو ــ گویژ کە خواردمەنین وەك میوەجات .

دارستانی بەرهەمیکی گرنگ بو بو دورست کردنی خانو بەرە . وە بو ساز کردنی چیشت ( شیوی ) وخواردەمەنی وەبوسوتەمەنی زســتان هەروها ئەم دارانە کەلو پەلی جوت وە کشتوکالیش لی دورست ئەکرا وەك هەوجار

ـ مژان ـ وەئەستندو ـ دارجوتیار ـ سەرکلاوە ـ شەقلە •

وەدارو خەلوز ( رەژوی ) لی ئەکرا وەبو شار ئەهینرا •

## ۱۲ـ هەروها

چیاوە دشتی هەولیر بەرهەمیکی تری بو وەك ئیستە بە (خوای نابت) بە زبانی خو ولاتی هەولیر ئەم وشەیە لە کونەوە بەکار هینراوە •

وئەم شتانە زوریان لەکاتی بهار پیائەبن وەك کـەنگر ـ تولکـە ـ کاردی ـ دومەلان ـ گیوژ ـ قازقان •

## ۱۳ ـ باریزتنی کشتوکال

ئەم شتە چەند ریگاو دەستوری کونی خوی بووە بو پاریزتنی گەنم وە جووەدەغلی تر •

زور سال مشك لە زوری پیا بووە ئەگەر نەگیرا وەنە فەوتابی زیانی لـە خەلە داوە وە بەرنگاری گیراوە بەگرتن وەکوشتن وە زهر خسـتنە کونـە مشك وە دەغل لە کوشکە پاس کراوە ، وەکلە ( کلو ) وەکیسە لـە ئـەم دو ئانە تەش زیانی بو دەغل بووە •

دەغل پاریز کراوە بو ئەوەی مەرو مالات تیایا نەچی وە زیانی لی نەدا •

بەرنگاری ئەم شتانە هەریکە شیوەیکی تایبەتی لەکونەوە هـەر بووە وپشیی پیا بونی دەستوری تازە بو دورینەوەی وپاككردنی دەغـل لە زەوی

وەلە جوخین هەرکات ترس سوتانی بووە بەلام لەم دەورە ئەم ترسە کـــەم بویتەوە بە بونەی ئەوە کە دورینە وهەل گرتنی دانو بەرە وەك پیشو ماوەیکی زور لە دەشت نامینتەوە •

## ١٤ ــ ئابوری کشتوکال :

خاکی هەولیر هەمو چەشنە بەرهەمیکی بەخشی وە بە نشتمانی ئەم خاکە جوانە وەبەرهەمی کشتوکالی شاری هەولیر وەولاتی ودیهاتی هـەردەم لـە پیوستی دانشتوانی زیاتر بووە وەهەروها کرین وەفروشتن وکار بەدەسـتی تر هەمە رەنگ شیتان دورست کردوە لەبەر ئەوە ئابوری هەولیر بەهیز بووە وزور کەم شت پیویست بووە کە لەدەروە بوی بهیزی •

بەر هەمی زەوی هەولیر گوندەکانی رنگاو رەنگ بووە زور سال زیاد بووە وە نیزراوە بو دەرەوی سنوری هەولیر بو جیگای تر لە عراق ویـا بو ولاتانی بیگانە ( وەك گەنم ــ جو ــ نوك ــ نیسك ) •

## ١٥ ــ پوش وەپەلاس :

دەغل پاش دورینەوەی زەوی قەسل وپوش پەلاش تیا ماوە وە بە پەریز تاو دانراوە ئەم پەریزە میگەلە مەڕ بزن وە مالی تری تیا رەوەلاوە ماوەی (٣) مانگ •

وەزورگ وە هەلەت وچیا گیا وگولی لی رواوە بەشیکی پاس کراوە بو پایز وەزستان بە پاوان ناو براوە بە بونەی ئەم بەرهەمە جوانە ئەتوانین بلین پیش سالی ١٩٣٠ هەتا سالی ١٩٤٠ ژمارەی مەر وبزن وەرشە ولاغ وولاغی بەرزەی ناوچەی هەولیر لەیك ملیون زیاتر بووە •

## ١٦ ـ بنەماڵانی هەولیر وکشتوکاڵ :

بنەماڵانی کونی هەولیر زوریان کشتولیان بو وئەم شارە ودیهاتی هیزی گەورەی ژیانی بەرهەمی گەنم وجو بو هەروەك باسمان کرد لە ناو شــاری هەولیر نزیکە دوصەد جوت ئیستر بو وهەر وەك باس کرا گەلی مال خــاوەنی گوند بون •

گەورە تیرین خاوەن گوند ملا افندی بو کە بە ناو دار ترین کەس بو لە هەولیر لەکاتە خوی وەخاوەنی نزیکەی (٤٠) گوند زیــاتر بو وەدانشگای خوی لەقەسری خوی بو لە باداوە کەلەم قەسرە ملك فیعل یکەم دو جار بــە میوان داری ماوەتە وە لە بین سالی ١٩٢٢ ـــ ١٩٢٩ وهەروها مــاوەی مانگی فیصلی دوەم لە سالی ١٩٤١ لە کاتی حکمداری رشــید عالی کیلانی ئیراوە بو باداوە ، وەلیردا ناوی ئەو ماڵانە چەندی لە یــادم ما بی کە لە ســالی ١٩٣٠ وەپیشتر خاوەنی زەوی وەکشتوکال بوینە ـــ وەك مالی ( یعقوب اغا ـــ رشید ویس اغا ـــ ومالی عمر اغا حاجی احمد و عبو اغا عزیری ـــ مردان اغاـــ مالی محمد اغا میرم خان ودەباغەکان ـــ پیربال اغاـــمالی عبدالله چەلپیـــعبدالرزاق اغا عالم ـــ سید احمد اغا نقیب ـــ مالی حسن اغا صالح سور چاوشلی ـــ مالی زیور اغا ـــ پیرەباپی بنەمالەی حیدەری ـــ شیخانی خانقاە ـــ شیخ محیالدین شیخ صالح ـــ مالی تەیرو ـــ مالی حمو علی زمو ـــ وبنــەمالی علی پاشــای دوغرمەچی وچەند بنەمالی تر کە لە کاتی ئەم وتارە بە یادی ناکەم •

وجیگای هەل سوراندنی کاروباری کشتوکاڵ لە ناو شار ودیهات حساری پی ئەوترا لەم حسارانە خانو وعەنبار وتەویلەی والاغ بو ـــ لەگــەل کــادان ( لەودە ) •

هەر ژوریك ئەدرا بە رنجبەریك وعەنبار گەنم وجولی تیا دائەکرا ولـە ئەویلە ئیستری جوت واسپ وماسین سـواری ئەبەسترا لەنـاو هەر حساری لەودەیك یادو بو بو هەل گرتنی کا بو ئالیکی ولاغ •

وئەم حسارانە زوریان لەسەر شقامی مظفریە بو کە ئیستە شـوینەکانی بوینە دوکانو بازارو بالەخانە وەك حساری حمو علی زمو حساری نورالدین محمد اغا ـ وحسار عمر اغا ـ وەحسار علی پاشا وپاش جـادە حسارە جوتی داود اغا ومحمد علی اغا یعقوبی •

ولە گەرگی عەرب گەورتین حەسار دو حسـار بو یکیـان حسـاری حسن اغا چاوشلی کە پاش سالی ١٩٣٥ کرا بە قشلەی پولیس سواری •

وەدو حساری تر ئەندازەیان گەورە بو لە گەرکی عەرب حساری مردان محمود اغا وحساری مالی حاجی رشید اغا وچەند حساری تر لەم گەرکە بو وەك حساری شیخ‌محی‌الدین وحساری مالی شیخ‌چولی وحسار علی‌ویس‌اغا •

ولە گەرکی خانقاە گەورترین حسـار دیسان هی باوکی حسـن اغـا صالح سوری چاوشلی بو ئەم حسارە زور کون بو وە لەکاتی هـاتنی محمد پاشای رواندوزی بو هەولیر ئەم حسار هەر بوە بیجگە ئەوەی جیگای دەست گیرانی کشتوکال بو دباخانەیکی تیابو ولەناو وە دابەش سی جی کـرابو بو کشتوکال وە بو میوانداری وە بومال • وئەم حسارە بەشیکی لە سالی ١٩٣٢ درا بەکری بەخزمیك وەکرا بەخان وپاش سالی ئاوبرا وبەئاوی خانی قوچـە ئاوبرا وبەش دوەمی پاش سـالی ١٩٣٥ درا بەئاشنایك بەکری درا بەخـان بەناوی خانی حسن بیرام شهرتی وەرگرت ـ گەلی کەس وائەزانی بونی ئەم دوخانە میژوی کونـە ـ بو روشـنا کردنی ئـەم بروایە لەم باسـە دووام

بی گومان ئەم دوخانە ماوەی (٤٠) سال کەمتر بە خان ماوەن وپیشتر جیگای کشتوکال بوون وئیستە لە لایان خاوەنە تازەکانی پیش شەش ســـال ئەبی کراوتە دوکانو بازار وە بالەخانە وبەشیکی بچوکی تائیستە بە خان ماوە•

## ١٧ ــ وینەی چوار گوشەی هەولیر :

پەنجا سال لەمەوە بەر لە رادەی ١٩٣٠ پیشتر ئەگــەر وینــەی چوار گوشەی هەولیر وەرگیرا بایە ویا نقشەیکی بو بکـــرایە چوار کاریـــز ئـــاو کەوتوبووە سنوری شار ــ کاریزی میری (بلدیە) کە خاوەنەکەی شارستانی هەولیر بوە وئەم کاریزە سەرو چاوەی ئاوی دانشتوانی شاربو وئاوی ئەهات ناو شار لە دەرگای بازاری گەورە (حوضیکی ئاوی) بو درست کرابو سەقا بە وەلاغ ئاویان ئەگوزاتەوە مالانی قەلات وهەندی خـــانووانی گەرکەکانی کورتەك وزور سال ئاوی زیادی ئەم کاریزە سەوزە وشیناي وەبرنجی لەبـــەر ئەکرا لە زویەکانی وارش ویا خاکی گوندی باغمنارە •

وە کاریزی دوهەم بە کاریز هەولیر ناو ئەبرا کە خاوەنی ئەم کاریـــزە (عطاء الله اغا) بو وە ئاوی ئەم کاریزە ئەگیشە نزیك مزگەوت ونزار گاهی شیخ الله ــ پایز وهاوین لەبەر ئەم کاریزەش سەبزە وشینای ئەکرا وخەلکی گەرکی خانقـــاە وسی طاقـــان وە ســـیدا ئـــەوی پیری ئـــاو لە مالی نەبایە ئاوی ئەم کاریزەی بە کار ئەهینا لەنزیك نەزار گاهی بابەحیدر لەبەرئەم کانیە حەوضیکی ئاو دورست کرابو،وەبەلای ریگا موصل ئەو بەلای بەستوەکە ند شیخ قاضی دو کاریزی تر بو یکیان بـــە ناوی کاریزە گەورەی مـــالی سعید یعقوب اغا ناو ئەبرا وە دو هەمیان بە کاریزی بچولك ناو دار بو لەبەر ئـــاوی

ئەم دو کاریزە لە دو جیگا شینایی وبستان لی ئەکراوە (٣) س باغی میوەجات داریش بەم ئاوە ئاو ئەدرا ولەم باغانە گەلی میوەجات تیا بو وەك تری ــ هەنجیر ــ هەنار ــ قیس ــ زیتون ــ تو ــ هەتا خوم بە چاوی خوم لە کاتی خوی دیم کە لایکی باغیکیان دار فستق تیا بەبەر هاتبو ولەبەر دەمی ئەم دو کاریزە (٣) س ئاشی ئاوی تیا بو ــ دانشتوانی شار باراش ئاردیان لەم ئاشانە لی ئەکرد •

ولە کاتی ناو براو ئەم جیگایە کە لایکی تەواوی شاری ئەگریتە هەردەم سوزوە بو وجیگای سیرانگاه بوو لە بهار وهاوین وەگەلی لە دیهات نزیك شار کاریز وباغی تیابو وەك ــ قەتەوی وقونیان ــ وکنسنران ــ وبنەسلاوە ودیهاتی تر کە ئەم جیگایانە یك لە یك جوانتر بون سیرانگاهیکی تواو بوون• ولە ناو مالانی شار پیش سالی ١٩٣٠ تا ١٩٤٠ لە هیچ مالی باغوباخچەی گول ودار نەبو بجگە قصری ملا افندی وقصری عطاء الله اغا تەنها لەهەندی مزگەوت یك دار توی تیا پەیا ئەبو •

وشایانی باسە پیش سالی ١٩٥٠ نەبسترا بو ونەبنیرا بو کە لەهەولیر یا لە باغاتی دیهاتەکانی دار پرتقال یا لیمو بکری وەبەر بدات • لەم باسەوا درەکەوت کە شاری هەولیر وگوندکانی جیگایکی پیش کەوتو بووە لە کشتوکال بەهەمو رەنگی وە تەمەنی ئەم شارە و کشتوکال بە سال نازمیری و کەس نازانی کەی ئەم شارە دورست کراوە ولە سەرزەمیند پیدا بووە •

ئەم دەستورەی کشتوکالی کون و ئەم بەرهەمە رنگاو رنگە و ئەم کارو باری جوتە ، ئەم کاریز وە چاوگە ئاوانە لە گەل هەمە چەشن باغو باغچەی جوان کە لەمەوەپیش بووە ماوەی پیش کەوتنی کومەلایتی ئەم

ولاتەیە کە بە سایەی ئەم خاکو خولە دانشتوانی وەلات هەردەم لــە خوش بورینە •

و ئەگەر سەرنج بدەین بومان دەرئەکەوی لە (٥٠) ســالی رابوردو تــا ئیستا بە تەواوی دەستوری کشتوکال وە کارو بــاری گوراوە هــــەروەك کومەلایتی وژیانی گەل زور شتی گوراوە •

لەم باسە ئەو شتانەی دەربارەی کشتوکالی کون وبەرهمی وە ئابوری ولاتی هەولیر نوسراوە وینەیکی تەواوی رابوردەی کونــە زور شــتی باس کراو لە بەندانی پیشو ئەم وەتارە پەیوندی بە ژیانی ئەمرو نەماوە هــەندی شتی تر کەم کەس ماون کە شیتکی کەمو زوری لی ئــەزانن و ئــەم رابودە کونە دەربارەی کشتوکال ئەگەر لە دەفتر نەنوسری پاش چەند سالیك هیچ کەس پیی نازانی لەبەر ئەمە ئــەم یاداشـــتە واهــەرپرتوك ئــەو وتــاریك وەنوسراویکی تر لەلاین هەر برا نوسەریك بنوسری وائەزانم پاشچەند سالیك ئەبیتە سەرو چاوەیەکی بەنرخ وبەســود بو باس میــژو وکومــەلایتی • ورابوردەی ژیان لەم ولاتە •

* * *

# ( بەشی شەشەم )

# ئاهەنگ ورابوردن لە کومەلایتی کون لە هەولیر

لەم وتارە باس هەمو چەشنە یاری و ئاهەنگی وەچەند شتی تر ئەکری کە پەیوەندی بە رابواردن هەیە •

کومەلایتی کورد لە ناو شـاری هەولیر و لە گوندەکانی وەلـە نـاو کوچەراتی رنگاو رەنگ بەچەند شیوە وە بابت شت بووە بورابوردن ، ئەم کردوانەی کون زوری لە سەر دەستوری پیشوی نەماوە و دەربارەی ئـەم کردوە کونانە شیوەی کونی چلون بووە وچون گوراوە بەند دوای بەند لەم نوسینە ئەم باسە رون ئەکینەوە •

## ١ ــ چیروك :

بونی چیروك لە شاری هەولیر و گوندەکانی بەجی ماوەیکی زور کونە و پیش سالی ١٩٣٠ لە شەوانی دور و دریژی زستان بو رابوردن چـیروك بیژتن بە کار هاتوە وگیرانەوەی چیروك زور بە نرخ بووە چونکی لە کاتی ناو براو ــ رادیو ــ تلفزیون و روژنامە وە گوڤار هیچ یکی نە بووە •

لەبەر ئەوە چیروك بیژی پیاو لە دیوانخانەکان وە لـە چایخـانەکان ، چیروك بیژی ژن لە مالان بو ئافرەت وە منال چیروکیان بە شەو ئەگیرایەوە•

چیروك وتن پی ویستنكی گرنگ بووه بورابوردن ، چیروك بیژی وا بو كه له شاری بو شاریكی تر ویا گوندیكی تر ئه‌چو بو ئه‌وه‌ی چیروك بگیریته‌وه.

وه ئه‌م چیروكان له پرتوك وه‌یا له گوقار نه نوسرابو ئه‌وانه‌ی ئـــه‌م كازه‌یان ئه‌زانی وه چیروكیان ئه‌گیرایه‌وه له به‌ریان كردبو •

وه گه‌لیكیان ئه‌م زانسته له دایك وه باوكی خویان فیری ببون و یا له چه‌ند چیروك بیژی تر ئه‌م زانستیان وه‌ر ئه‌گه‌رت •

و ئه‌م چیروكانه هه‌ندیكی مه‌به‌ستی وه ره‌گه‌زی به رابورده‌ی شـــاری هه‌ولیر وه ناوچه و هه‌ریمی بووه هه‌ندیكی تری له ناوچه‌كانی تری كوردستان وه‌رگیرا بو •

و ئه‌م چیروكانه هه‌مه ره‌نگ و ئاوینه‌یكی روناك بون ده‌رباره‌ی ژیـــانی كون وه ده‌رباره‌ی میژوی كورد و پیاوی ناوداری وه پاله‌وانی ئازای و یـــا بادی شه‌ر وجه‌نگی رابورده‌ی ئه‌كرد وه بابه‌تی تر مه‌به‌ســـتی بـــه دلداری و خوشه‌ویستی بو •

و ئه‌م چیروكه كونانه جیگای شانازیه وه‌پی ویستی باس و لی‌كوینه‌وه‌یه له به‌ر ئه‌وه‌ی زوریان زانستیكی به نرخی تیا هه‌یه ده‌رباره‌ی ژیان و كومه‌لایتی ومیژوی وه‌رابورده‌ی كورد وكوردستان •

و ئه‌م چیروكه رنگاو رنگانه زور كه‌می تا ئیسته نوسراوته‌وه وچیروك بیژ له سه‌ر ده‌ستور و شیوه‌ی كون له شاری هه‌ولیر و گونده‌كانی له نه‌مانه له به‌ر ئه‌وه پیوسته چه‌ند نوسه‌ریكی شاره‌زا خه‌ریكی كوكردنه‌وه‌ی ئـــه‌م باداشته كونه ببن زو به زو پیش فه‌وتانی ئـــه‌م باســـه كونانه گه گـــه‌لیكی

مەبەستی بە میژوی پیش چەند چەرخیك وبنج بنەوانی کومەلایتی وە ژیانی ئەم گەلەیە •

وە شایانی وەتنە کە لە سلیمانی چەند نوسەریك هەندی لە چیروکانی ولاتی شارەزور وسلیمانیان کوکردیتەوە انجا پیوستە نوسەری هەولیر وە بادینان وە ناوچەکاتی تر پەلاماری ئەم کارە بدەن بە هونەرمەندی وبە هیزیکی تەواو

ولە کاتی کوکردنەوەی ئەم هەوالە کونانە ئەبی هیچ زانستیکی تیا نەگوری ئەگەر پەیوەندی بە میژو بی •

وە چیروکی تر ئەگەر دەست کاری تیا کرا بوریك خستن بە شیوەیك کە خویندوار ئالودەی خویندنی بی بە پەروش •

## ٢ ــ گورانی وساز ( موسیقی ) :

گورانی لە شار وە دیهات بە چەند چەشن بووە ئیستەش هەروەك جاران لە باوی خوی ماوە وەپیش کەوتووە ، هەر چەشنیکی ناوی تایبەتی خوی هەیە وەك حەیران ــ لاووك ــ بەستە ــ مقام ــ قوریات بیجگە لەم بابەتە کونانە لە چەرخی ئەم دەورە تازیە پاش پیا بونی قوتابیخانە هەمە رەنگ گورانی قوتابیان پیابووە کە پەیوندی بە گەل وە نشتمان وە وەلات وخویندەواری هیە • وگورانی کون وەك حیران وەلاووك جار بە جار سەرو چاوەکەی لە هونراویك وەرگیراوە وهی تری لە رەگەزوە بوگورانی ریك خراوە ، لاووك وحیران وبەستە وگورانی تریش رنگاورەنگین هەندیکی بو

ئازای و یا به شانو بالای پیاوی نـاوداری به کـەلك وتراوه ویـا بـاس هونەرمەندیك ئەكات ویا بودلداری وه خوشەویستی بیژراوه •

وه گورانی هەر چەشنیکی ، بابەتیکی له شوین کاتی پی ویستی بەکار دیت وەك گورانی زەماوند وه شایی وەهەلپەرکی واهی تری له کاتی دورینەی دەغل ئەوتری ( وئەم چەشنه ) که مەبەستی به دورینەوەی گەنم و جویە رو به ئەمانو وه فەوتانه لەبەر ئەوەی دەستوری خەلـه ( دەغـل ) کوکردنەوه به تەواوی گوراوه •

وگورانی بیژ هەندیکیان کاریان ئەمه بوه وه ژیانیـان بـەم ریەوه رابوردووه وه کەسانی تر بو هەوەس بونه گورانی بیژ له ئاهەنگی تایبـەتی زەماوەندی دوست وبرادەریان یا له کاتی سەیران رابوردن یا لەجوش دلداری گورانیان وتووه

لەگەل بونی ئەم چەند چەشنه گورانی رنگاو رەنگه له ولاتی کوردستان که به دەنگی خوش وتراوه وه له چیاو دەشـت دەنگی داوه وەدلی فرەوان کردوه وه مروی ماندوی پی حەساوه وه ئادەم زادی بـه جوش هینـاوه وه خستویته باوەش هەوەسو دل خوش شان به شانه ئەم ئاوازه خوشانه ساز وتەنبوری کوردواری کون به شیوەیکی پیش کەوتو هەربوه وه ساز تەنبور ( موسیقی ) دول وه زرنا و بلیور ـ و دەف و ساز و تەنبور تیکرا لـه گل گورانی له کاتی هەر رەنگه ئاهەنگ و زەماوەند و چەژن ئەم بەزمه سازه وه خوشه داگیر ساوه •

و شایانی وتنه له هەمو ئاهەنگی ، له کاتی سەیران ژن وپیاو دو بـه دو شان به شان گویان له گورانی و دهول وزرنا بووه و لەم ولاته ئازداره له

رۆژانی بهار بو دەشت دەرچوینه بوسەیری خاکی سەوز که به هەمو رەنگی گولالەی زرد وسور دا پوشراوه و لەسەر چاوگەی کانی و یـا له سـەرو چاوەی کاریز یا نزیکی روبار ئاو ولەقراغ دارستان وروباری ئاو و له نزیك زەوی که به دەغلی سەوز دا پوشراوه لەم شوینه جوانانه کوبونەوەیان بووه وزور جار لەم چەشنه رابوردنه گورانی وتراووه له گل لیـدانی سـازو تەبنوروه به دەست پیکردنی زرنایژ ودهول لیدان شایی چوپی ویاهـەل پەرکی رەش وبەلك داگیرساوه •

۲ ــ هەلپەریکی :

دانشتوانی گوندەکانی هەولیر به شایی ناوی ئەبن وبونی شـایی له ولاتی کورد زور کونه و هەزارها سال لەمەوه پیش پیا بونی له گەل بونی و دامەزراندنی شاری هەولیر له یك کاتو سەدیه و لەم گفته وادەر ئەکـەویت کورد له میژو خاوەنی کومەلانیکی شەنگ وبەرز بووه •

وشایی له گوندەکانی هەولیر به چەند جوریك کراوه وەك هەلپـەرکی ــچوپەیی ــرەش بەلەك•و هەر یکه لەم بەزمانه هەل سوراندنی به شیوەیکی تایبەتی بووه ، هەلپەریکی رەش بەلك ئافرەت وپیاو دەست له دەسـت شان به شان هەل پەریون وجار بەجار ژن به تەنها وەپیاویش به تەنها ریزیان گرتوه وریزی ژنان بەرامبەر به ریزی پیاوان شاییان کردوه •

ئەم پیاوانەی بوشایی کردن هاتون خویان بەجل وبەرگیك تازه ئامەده کردوه ژن وکچ کەبو هەلپەریکی هاتبی جلی رنگاو رەنگی تـازەی لـه بەرکردوه ، پیاو خوی به خەنجر وچەك رازاندوه وه ئافرەت به کـەلو پەلی

رازاینەوە ئەوجا دەستی بە هەلپەرکی کردوە لیرەدا وا بومان دەر ئەکەویت کە ئافرەتی کورد بە رابوردەی میژو پیش کەوتو بووە و لە تەرازو ژیان لەگل پیاو لە یك کیشانە بووە •

هەلپەرکی لە کاتی ژن خواستن لە زەماوەند ئەکری هەر وەها لە روژی چەژن وخەتەنەی منال ئازدار و لە نەوروز وە لە کاتی سەیران وە هەمە رەنگە ئاهنیك ئەکری وە جار بەجار شایی بو بە خیر هاتنی پیاوی گەورە وەناودار ئەکری لەکاتی هاتنی بو گوندیك بو پشیاندانی دل خوش وەشایی تەواو روت بە روتی بی تامە وە پەسند نیە ئەگر گورانی لە گل نەبی وە دهولو زرنا بە کار نە هینری شایی بە گورانی خوش وە دەنگی دهول وە زرنا بە تەواوی دورست ئەبی وە وردە وردە شایی کەران بە جوش دین وە هەوسیان بالا ئەکەویتەوە بو ئەوەی کە شایی گەرمو گور بی وهەر چەشنە هەلپەریکی گورانی تایبەتی خوی هیە کە لە گەلیا بە کار دیت و هەر وها چەشنی ساز و تەنبوری دهول و زرنا بو هەر بابەتی هەلپەریکی جیاوازە •

زورشت کە مەبەستی بەرەگەز وبنج بنەوانی کومەلایتی گەلی کورد، لە فەوتانە وە رو لە بزر بونە بە گورینی ژیان وپیش کەوتنی بە لام گورانی ــ وهونراو ــ وچیروك ــ وهەلپەرکی وە ساز ( موسیقی ) کوردی هەر بەردەوامە و لەپیش کەوتنە •

٤ ــ راو ــ چەك وەسواری :

راو وسواری وەچەك بە کار هینان ئەم سی شتە بەپیشەی کونی دانشتوانی شاری هەولیروە گوندەکانی ئەژمیرین • وە گەلی ئەم شارە وە ناوچەکەی بە هەوەسەوە ئالودەی ئەم سی کردەوەیە بون وە پیویست بووە کە هەر کەس

فیری سواری ولاغ پیست وەرم بازی بە ئەسپ بکات •

فیر بونی ئەم کارە تەنها بو هەوموس وە رابوردن نەبووە لەبەر ئەوەی بە پیسوستیگی گرنکی کومەلایتی وژیان دانراوە تەنها سواری ولاغ بو ئاموشو وەگەران وەکاروان بە کار هاتووە وهەر وها سواری زانین زور پی ویست بووە بو کاتی شەر و جەنگ و بو پاریزتنی وەلات لە دوژمنی • وسواری باش وە لی کەوتو لەهەمو کاتی لە شەر سەر کەوتو بووە •

شارستانی هەولیر وجی نشینی گوندەکانی زوربەیان خاوەن چەك بوینە لە چەرخانی پیشو ــ رم ــ تیروەکەوان ــ وە شمشیر ــ وە خەنجەر لە شەر بە کار هینراوە وە پاش پیدا بونی بارود تفنگ وە شەش ئاگر بوینە چەکی شەرکەر وە تفنکچی باش لە کومەل ناو داربووە • وچەکدار نیشانیان دانــاوە لە گورەپانەکانی نزیك شار ویا نزیك گوند وەمەبەست لە مەوە ئەوە بووە کە بزانری کام کەس نیشان گری باشە وە لە لایکی تروە بو ئەوەی گەنجەکان فیری تفنگ هەلگرتنی وبەکار هینانی بین •

ولیرەدا پی‌ویستە کە خویندەواران روشنا بکرینەوە کەخەنجر هەل گرتنی لە کاتی خوی زور بە پی‌ویست دائەنرا وە زربەی پیاو لە شــار وە دیهاتکان خاوەنی خەنجر بون وە لە شاری هەولیر چەند کەس بو کە کاریان خەنجر دوروست کردن بووە •

سەرەتای سواری وچەك داری دانشتوانی شاری هەولیر وە گوندەکانی وەك جی‌نشین وەك شارستان وە لادیی تری کوردستان زور کەسیان ئالودەی راو کردن بوینە •

وەراو بە چەند شیوەیك كراوە وەك راوی گەروشیك بو پیك هـاتنی ئەم چەشنە راوە پی ویست بە چەند سواریك بووە لە گل دوسی تاژی رست كراو ئەم سوارانە چوینە سەر زەویك كە ئەم نیچیری تیا پیا ئەبی لە كـــاتی گەیشتن بو سنوری زەویك سوارەكان پەرتەیان كردووە وە ئەم خاكە یان هەل پشكتووە بە گەران وسوران سوارەكان قەد بە قەد تەماشای زەویەكە كراوە تا كەرویشك لە لانەكەی دەدیتراوە وە یاهەلاتووە انجا تاژی (تانجی) رست كراو كە جەلەوی پەتەكە بەدەستی سواریك لــە سواران بووە تاژیەكـەی بەرەلای كردوە بە دوای كەروشیك وە ئەم سوارە بە دەنگیكی بەرز ئـەی وت ( دیار دی ) ئەی ئەمەتە وادەركەوت ، و مەبەســت لــەم بانگ كـردنە كەسواركانی تر ئاگەداربن و لە هەمو لایك تەكانی ولاغیان بدەن وە رابكەن بە دوای نیچر و دەوریەی بدەن نەك بزربیت و یارابكات و یالە پەنـا پنچگی خوی گوم بكات وەسوارەكان دو بەدو تاژی ویا لەدەوروپشــتی نیچیركە ئەخولانەوە تا تاژیك كەروشیكی ئەگرد لەوكاتە دەست بەجی سواریك لــە ولاغی دائەبەزی وسەری كەروشیكی ئەبری وە لاشەی تە واوی كەرویشك سواریك ئەی بەستە پاشكوی ئەسپەكەی : وگوشتی كەرویشك زور جـــار لە گل پلاو ساوەر ئەكرا بە چیشت وە پیستەكەی لە سەر رایخ وە دوشــك بەكار ئەهات ویا بوسەر زینی اسپ وجار بە جار بو بەرگی فـەروا بەكـار ئەهینرا وەراوە ئاسك ( مامز ) بەهەمان دەســتور ئەكـرا تەنهـا ئـەوەی پیوست بو ئەم تەرحە راوە لە روژی پاش باران ئەكرا بو ئەوەیی زەوی وزار قوربی تا سمی مامز لەقور گیربی وە بچقی تا بە تەواوی نەتوانی بــاز بازانی بكا وەهینری راكردنی سست بیت وە دەرفتی نەبی خوی لە تاژی بزر بكات بو ئەوی تاژی پە لاماری بــدات وە بیگری وە سواری لە ولاغ ئــە هاتــە

ئواری که ئەم نیچیره له دەوی تاژی وەربگری وەسەری ببری •

وچینه راوکەری تر به تفتگی (چاخمخدار) راوی ئاسکیان ئەکرد •

پیش سالی ۱۹۳٦ ئەی پیشی (٥٠) سال چوار دوەرەیی هەولیر گەلی
دەویکانی کەرویشکی تیا پیا ئەبو وەزورگ و هەلەتی چوار کوشەی شار
وەك خاکی رەشکین عینکاوه شمعون ئاوا ــ سویری ــ پیرزین ــ بیرکوت
ــ ملا ئومر بنەسلاوه و کسنزان ــ لەم شوینه نزیکانه بەروه هەر لاریگا لات
ندایه چاوت به مامز ئەکەوت و زوربه ساتای گەلی مال لەشار فەرخه مامزی
به دیاری بو ئەهات و له ناومال به خیوی ئەکرا •

ورده ورده وەسال دوای سال ئەم جەنەواره جوانه بەرەو نەمان چو به
پیابونی تفنگی تازه وه اتوموبیل کەراویان پی ئەکرا وئەم راو چیانه بەبی
بەروا هەتا لەکاتی (ئاووس بونی راویان) هەر ئەکرد مامز راو ئەکرا ولە
رگی بیچوەکەی ئەفەوتا و فەرخه وکار مامزیش بەزندو راو ئەکرا ئەم جوره
راوه بی نامه و ئەم هەلەمەته گرو گەرمه به دوای ئەم بی زمانه بووه ماوەیی
فەوتانی ئەم زنده واره جوانه •

وەئیسته له شوینانی لاچەپ وزور دوره ئاوای تاك تاك کەرویشك
هیه و له ئاقاری دیهاتی شاخاوی وەهەلەتی زور دور جار به جار چاویان به
مامز ئەکەوی •

وه گەلی درنده وه دعبای تر له دیهاتانی نزیك شاری هەولیر بو وەك
ریوی وچەقەل وچەند تەیر توالی زور قەشەنگ وه جوان ئەم جانەوەرانەش
وش هەمان بەزمی راوه کەرویشك بوون به کار هاتنی چەند چەشنه چەکی
تازه هه تاسیان لی بری ولەم خاکە هەندیکی دور کەوتەوه پاش فەوتانی

تاخەمیك زوری • و لە گوندانی چیا حیوانە کیوی راو ئەکرا بو گوشت
وچەند بابەت دەعبای تر لە بەر پسیتس راو ئەکرا ئەم درندانەش لەم کاتە
زور کەمی ماوە ئەگەر لە هەندی لوتکە شاخی بەرز جار بەجار چاوی
بکەوی وزربەی ئەم زندەوەرانی بە هەمە دەردی چەکی تازە زوریان لە
چون •

وەتەیر وەهەندی زندیی تر بەتەلە ـ وەفاق ـ وەتور راو ئەکرا و
ـ کەو ـ کوترە کیوی ـ قەتی ـ رەشولە کوشکە ( چولەکە ) وقەلەرەش •
وەدو تەیری گەوری زور جوان کە بەچرك وحەبارە ناو ئەبران لەکا
درەوی خەلە لەناو زەوی وزار پیا ئەبون وچرك لە گەورەی وەك علی‌شی
ئەبو وحەبارە لەمریشك بە لا تر بو ئەم دو تەیرە پاش سالی ١٩٤٥ ز
کەم بینراوە •

وبە سایەی تفنگی تازە کەو لە چیا وپور لە دەشت هەمیشە توش دەر
بەلای کەم بونە و زور دور نیە ئەگەر پاریزیکی توند و توش نە کری پا
ماوەیکی کورت بنەرەتی ئەم دو نگارە جوانە لە ئاسمانی کردستان دو
پی دیت •

راوچی کون زوریان بو هەوەس و رابوردن ئالودەی ئەم کار وە بەز
بون کە توش ژ انیکی خوش ین سەرەتای تەندروستی لەش وە ئاسودە
هوش و هەل پشکوتنی دل وە سازی گیان •

وە مروی تر خەریکی راو بوینە وئەم کارە سەرەمایەی ژیانیان بو
نیچرەکانیان لە بازار فروشتوە و بە سایەی ئەم ئیشە راوچی خوی وە ما
منالی ژیاوون هەندی راوچی کاری تریش بووە وهی تر تەنها بەم کارە

ردوەیە بەڕیوە چون • تا ایستە کەسانی وا هەیە بە دەوری دائم خـەریکی
اوە تەیرە وبازاری گەرمە وپاریکی باش رۆژ بە رۆژ بە چەنگ ئەکەوی•

بیجگە لە راوی تیر وە توال راوچی تر پاش سالی ۱۹۵۰ کەم بوینەوە
خصوصی راوکەری کە راووە بو رابوردن وحەوس ئەکات •

ـ یاری کردن :

یاری و یاوازی کردن ئەم کارە پاشماوەیکی میژوی کونـە لە هەولیر
ە دیهاتەکانی یاری ( ریاضە ) هەر بووە پیش پیا بونی قوتابیخانە گەنجەکانی
سار وە دیهات گەلی چەشنە یاریان کردوە لە کاتی دەست بە تالی و یالە کاتی
سەیران لە روژانی بهار و ئەم یاریانە دو بابەتن یاری لەش ( ریاضەی بەدەنی)
ە یاری دەست •

یاری لەش تەنها کردوەی گەنج وهەرزەکار بووە وئەم یاریانە چەند چەشنو
ابەت بوینە وەك ــ را کردن ــ باز بازانی ــ پشتی پشتی ــ قاشـــو ــ و
ەت پەتین ــ و گوریس راکیشان ــ و توپ توپانی ــ وە زور یاری تریش
ە یاری تایبەتی لە لایان سواری چاك بە چەند شیوەیك کراوە •

وەبابەتی دوەم یاری دەستە هەندیکی بە روژ کراوە وە زربەی تری شەو
ە دیوانخانەکانی شار وە دیهات کراوە ئەم یاریانە لە شەوانی زســتان زیاتر
کراوە لە بەر دور و دریژی شەوی زســتان وە لە لایکی ترەوە لە مانگانی تری
سال بە روژ کار وباری کشتوکال بوینە ماوەی ماندو بونی خـەلك چونکی
ە روژ خەریکی ایشو کاریان بوون •

هەر وەها لە زور چایخانە وە قاوەخانەکانی شار هەمیشە ئەم یاریـــ
ئەکرد •

یاری دەست تەنها بو گەنج وجاحیل نەبو بەلکو زور بابەتی لە لایـ
پیاوی گەورەی بەریز بە پەروشەوە ئەکراما وەك داما ــ ظرف وفنجـان
یاری انسگوستیلە ــ ( مەتقلی بەرد ) یاری فنجان ــ بالیفانی •

وەشەرە گەرك لە لایـان گەنج ئەکرا وەك یاریك کـە بزانری کـام
ئەزایە ئەم شەرە گەرەکە بە چاوی برایتی وخوشـەویستی ئەکرا بـە هیـ
جوریك پەی وەندی بە کینە وەرقە بەری و ناخوش نە بو •

و یاری تر بو بو منالی ساوای گەنجی تازە پی گەیشتو وەك ئاش قولانـ
بو کیج ــ و یاری تیغ تیغانی ــ و یاری کەلای بەرد بو منالی کور ••

وا دیارە ئەم چەند بابتە یاری لەش وە یاری دەست وە یاری منالان کە ئە
جورە یاریانە زوریان بەجی ماوەی میراتی ئەم خاکو خولەیە بیجگە لە یـار
دومینە وەتاولی وادەر ئەکەویت کە لە جیگای تر وەرگیراوە •

لە ستونەکانی ئەم وتارە و لە دو زنجیرەی پیشویی ئـەم باسـە لـ
توانامانەدا رابوردەی هەوالی ژیان و کومەلایتی ئەم شارە تان بو باس کراو ئە
دەستوراتەی ژیان بنج و بنەوانی وە رەگـەزی ئەگەریتـەوە باشـماوە
دانشتوانی کونی ئەم شارەکونە هەزارها سال پیش ئەمرو هـەر چەند ئـە
زانستانە بە تایبەتی پیوەندی بە ولاتی هەولیرە لە گەل ئەمشدا ئەم روالا
و ئەم کردەوانە ئاوینەیکی تەواوە بو روشنا کردنی کومەلایتی گـەلی کور

ونشتمانی ئەم خاکە لە هەریم وە ناوچەکاتی تری کوردستان •

وپاشماوەی ئەم وتارە خوا یاربی دەست لە قلم هەل ناگرم تا بە تەواوی هەرچی لە بیرو یادم بی کە پەیوندی بە دەستوری کونی ژیـان وهـەوالی رابوردوی هەولیری هیە تاکوتایی پی دیت و مـەبەست لە لە ئەویە کە ئـەم یادگارە بو دوا روژ سەر وچاویکی بە کەلك بی وە کەسودیکی تەواوی هەر بمینی •

* * *

## ( بەش حــەوتەم )

## چەند لاپەریك لە نوسراوی هەندی نوسەر دەربارەی هەولیر

« شاری هەولیر لە کونda وەك هەندی نوسەر باسیان کردوە » ئەلین :
هەولیر شاریکی زور کونە لە گەل کاروانەی فەلەك چەرخەکەی ســوراوە ، ونوسران ئەلین ئەم شارە کونترین شارە لە سەر زەمین هەتا ئیستا ماوە • ئەم شارە کەس نازانی کەی دروست کراوە ، ئــەوەندەم لی زانیوە گــەلی لــە نوسەرانی‌میژو ( تاریخ ) ئەلین ئەم‌شارە شەش هەزار پیش ( میلاد ) دروست کراوە بە پی‌ی ئەم گفتە ئەی ئەم شارە هەشت هەزار سال تا ئیستاوە هــەر بوە• بەلی گەلی شاری کونی تر بوە بەلکو لە هەولیریش کونتر بەلام تــا ئیستا هیچ کونە شاری لە مانە بە دروستی نە ماوە •

روژی لە روژان وچەند سال لەمەوە پیش لە گەل برا کوردیکی ئاشنا بەمیژوی کوردستان باسی شاری هەولیرمان ئەکرد ، ئەم برایە ئەلی ، بەپی هەندی نوسینی کون وا روشنا بوە کە هەولیر پیش پە بدابونی زەردەشــت دانیشتوانی هەولیر لەســەر ئاینیکی کونتر بونــە وئەم ئاینــە هــەر خوا پەرستی بوە «وئەلی» کورد لە هیچ کاتیك بت پەرست نەبوە،وە لەم بەشە وا باسی هەولیر ئەکەین هەر وەك لە نوسینی هەندی نوســەوانی کون وەباس هاتوە •

١ ــ (( ياقوت الحموي ))

له نوسراوی «معجم البلدان» لاپەره ١٨٦ بەرگی (١)،له بابەت هەولیرەوه وتوتویه (( هەولیر شـاریکی زور کونه ، وقەلایەکی سـەختی هەیه وه لـه دەوراوپشتی ئەم قەلایه چەندەها خانووبەره دروست کراوه چوار دەورەی شورەیەکی مەزن وخەنەقیکی زور قوله تەنیوی قەلاکەی لەسەر گردیکی بەرز وله ناوچەی قەلا بازارو مزگەوتی تیا بلاوه . ئەم قەلایه (( ئه شبهیته )) قەلای حلب گەرچی لەم زور مەزن تره ، وولاتی هەولیـر مابەینی هـەردوو زی ئەگریتەوه )) .

دیسان ئەلی ((ئەمرو شاری هەولیر شاریکی گەورەیه له پانی دوروژی وله خوار قەلاوه بازاروه قەیسەری وخانوی زوری تیا دروست کراوه )) هەروەها بووه ومظفرالدین زور پارمەتی هەژار وبی دەستەلاتی داوه ولای ئەم کەسانه ومظفرالدین زور پارمەتی هەژار وبی دەستەلاتی داوه ولای ئەم کەسـانه (( شخصیکی )) خوشه ویست بوه .

دانیشتوانی ئەم شاره کوردن ، وبیجگەلەقەلای گەوره چـەند قەلای تر هەیه، ئاوی خواردنەوه له بیروکاریزەکان هەل ئەگونجی ، ئاوی سازگاره دەوراوپشت جیگای کشتوکاله، بەلام میوەهات له چیای نزیکەوه بو شاری ئەهینری .

مەودای هەولیر وبغداد حەوت روژروشتنه )) .

٢ ــ له نامەی (( الحوادث الجامعة والتجارب النافعة ))

که (( ابن الفوطی )) نوسیویه . دەربارەی هەولیر له لاپەره ٩٨ ووتویـه له ١٧ شوالی سالی ٦٣٤ هجری خەبەر گەیشته اربل کەمغولەکـان دەرەوەی

شاریان گرتوه وئەیانەوی شارەکەشی بگرن • پەیدا پەی دانیشتوانی شــار سنگەرەکانیان پتەو کرد و خەندەقسەکانیان پاك کــردەوە •• مــیری شارەکە وعلمای دین فتوایان دا کە ســالی ئاوبراو شارو وپاراســتنی شار ئەبی بکری وئەو کە سانەی ئەیانەوەی بچنە حەج ئەبی سفریان بوسالی ئاینده بهیلن•مغولەکان هیرشیان هینایە ئاو بە لە شکریکی زورەوە و«مەنجەنیقیان» دامەزراند بەرامبەر شورە سەختەکەی اربل • توانیــان قسمیکی بروخینین ولەشکریان داخلی شارەکەبو ودانیشتوانی دەشتەکە هەمویان رویان کــردە قەلای هەولیر وقەلاکەیان بەند کرد بەرامبەر بە دوشمنی • لە سەرقەلا لــە شکری کورد بەرامبەر لە شکری دوژمن وەستا شەریان بە توندی کرد هەر چەند مغولەکان خوازەوەی شاریان ویران کرد وســوتاندیان لە قەلاوە بــە مەنجەنیق بەرامبەر بەو پەلامارەی مغول وەستان • وزوری لەشکری دوژمن خەریك بوقەلا بگرن بویان نەکرا • هەروەها چەند مانگیك بەم نوعە نەیــان هیشت دوژمن قەلا بگری ••• هەتا عسکری « خلیفة » لە بغــداوە بــەری کەوت بویارمەتی خەلکی وولاتی هەولیر بەلام لە پیش گەیشتنی لەشــکری « خلیفە » دوژمن گەراوە دواوە •

٣ ــ لە نوسینی «(المنشیء البغدادي)»

کە لە سالی ١٢٣٧ هجری نوسراوە بە فارس ولە طرف ماموستا عبــاس العزاوی گوراوە بوعربی « لەلاپەرە ٧٦ ، ٧٧ دەربارەی هەولیر هاتوە » لــە التون کوپری وبو اربل هەشت فرسخە •• واربل والایەتیکی کونە •• لــە زەمانی کوندا ئاوی زور بوە ، ئیستائاوی کەمــە چونکی زورجوگــەیەك کەئاوی پیائەهات فەوتاوە شارەکە بە شیکی لەقەلا دائەنیش ، نزیکەی هەزار

ماله وله خواروی قه‌لاش چوار هه‌زار مال هه‌یه • شاره‌که دارو درختی که‌مه به‌لام زراعه‌تی زوره وله چیاوه میوهاتی بو دی • مزگه‌وته کونه‌که‌ی روخاوه به‌لام مناره به‌رزه‌که‌ی هه‌تا ئیستا هه‌ر ماوه •

له هه‌ولیره‌وه به س۳ فرسخ دی عه‌نکاوه هه‌لکه‌وتوه هه‌مویان له سه‌ر ئاینی مسیحین وه حاکمیان له‌خویانه • ئه‌ما خه‌لکی ناوشار اسلام وشافعین•

٤ ــ (( قاموس الاعلام ))

« به زبانی ترکی له استنبول له چاپ دراوه • ده‌رباره‌ی شـاری هه‌ولیر ئه‌م باسه لی وه‌رئه‌گرین» شاری هه‌ولیر هه‌شتا•کیلومتر له موصله‌وه دوره• وبه‌ینی له‌گـه‌ل کرکوك هه‌فتاو پینج کیلومتره قـه‌لای شـار که له سـه‌ر گردیکی به‌رز دروست بوه شوره یه‌کی له ده‌وارو پشته وچه‌ند گه‌رکیکی تر له خواروی قه‌لاوه خه‌لکی تیا دانیشتوه

قه‌لاکه‌ی زورکونه وه‌ك‌پولایه • اربیل وه یا اربل نـاوی کونی ئـه‌م شاره‌یه •له چه‌رخه‌کانی کوندا شاریکی مه‌زن بوه له‌نزیکی شه‌ری گه‌وره‌ی• اسکندر ودارا به‌رپابوه ، له ناوچه و ده‌وراوپشتی زور جیگا هه‌یه که چه‌ند « اساری کونی » لی وده‌رکه‌وتوه •

دانیشتوانی زوریان موسلمانن ونزیکی هه‌نده هه‌زار اسلامی تیاکق‌بوه‌ته‌وه وس۳ هه‌زارو شه‌ش سه‌د که‌سی « مسیحین » •

« واده ئه‌که‌وی که قاموس الاعلام دی عنکاوا که مسیحیه کانی کوردی تیا دانیشتون ئه‌ویش له‌سه‌ر ژماره‌ی دانیشتوانی هه‌ولیر داوه ته قه‌له‌م »•

«...خەلکی هەولیر کوردن ولە دەوراو پشـــتی نزیکـەی سە٣ هــەزار وچوارسەو کوچەری خیوەت نشینی هەن » •

وادیارە لە بارەی کوچەرەوە کە لیرەدا باس کراوە ، ئەم « روایەتەی » لەکەسانی تر وەرگرتوە کە شاری هەولیری لەبەهارا چاو پی کەوتوە، چونکی هەتا چل سال لەمەو پیش تەنیا لە مانگانی بەهارا کوچەر ئەهاتنە دەوارو پشت شار وزوریان لە خیل «بولی» بون ، وئیستا هاتنیان بە اندازەیەکی کـەمترە وە لەبەر ئەوەی زور دیهـــاتی دەوروپشتی شـــار ئەکیلری بەیـــار بوخیلـە هات بە چەندك ناکەوی •

٥ ــ لە نامەیەك لە بابەت « مژوی اشوریەکان »

کە لە بیروت چاپ کراوە لە لاپەرە ١٠٣ــ١٠٤ دەربارەی شاری هەولیر باس ئەکا • لەونوسینە بەشیکی ئەنوسینی • «دکتور منکانا ئەلی » شـــاری اربل رولیکی گەورەی لەزەمانی کوتا بوە لە ســـەرو وخواروی دجلە ••• وزور کەس کە لەکوندا زەروەشتی بون لە قرنی یەکەمی میلادی بونیـــە بـــە مسیحی ئەمانەش زوریان •• تجار وصنعەت کاری تر بون وەك ئاسنگە روجولا ودارتاش ••• هەروەها اربیل ببوە مرکزی ئاینی مسیحی ••

لەم نوسینە وادیارە کە وولاتی هەولیر وشاری لەسەر ئاینی زەردەشتی بونە ولەقرنی یەکەمی میلادی هەندی لە زەردەشتیەکان ئاینیان بویتە مسیحی وئەوانی تر هەر بە زەردەشتی ماونەتەوە • وە لە نوســینی نوسەرەکانی تـــر داوەر ئەکەوی کە ئاینی اسلام لەوەختی « خلیفە عمر بن الخطاب » بلاو بوە ئەوە لە وولاتی کوردستان زەردەشتیەکان هەمو اسلامیان قبول کردوە لـــەم

وولاتەدا ومسیحیە کوردەگان زوری بون اسلام وهەندیکیان لەسـەر ئاینی مسیحی مان تا ئەمرو •

٦ ـ لە نوسراوی « ارض الخلافة الاسلامیة »

جغرافیەك کە لە کمبردج نوسراوە لە لاپەرە ٩٢ لە بابەت هەولیرە وە هاتوە « ئەم شارە کونە بە اربلا ناو براوە وئەکەویتە بەینی زی گەورە وزی بچوك ، لە کوندا ریگای کاروانی بازرگانی بوە وقەلابەکی سەخت ومەزن هەیە کە لە سەر گردیکی زور گەورە دروست کراوە ولە چوار دەوری شورە وخەندەق هەیە • لە ناو قەلا بازاریکی بوە لە زەمانی خویدا کونترین مزگەوت لەم شارە بە مزگەوتی « دەست پەنجە » ناو براوە کە لەسەر بەردیك وینـەی دەستی هەلکەنراوە مزگەوتی « پنج ئەنگوستە » •

لە چەرخی حەوتەمی پاش عیسی ئەم شارە زور پیش کەوتوە وردە وردە گەورە بوە • ئەم شارە بە کشتوکال بە ئاوبانکە بووخەلەو وەغلو دانی زوری تیا کوکراوەتەوە •

٧ ـ دورثی ماکای کە نوسرەیکك انکلیزە

ولەبابەت شارەکانی عراق نوسیویەتی لەلایەن یوسف یعقوب مسکونی ترجمە کراوە بە عربی « مدن العراق » لە لاپەرە ١٣٧ ، ١٣٨ ، ١٣٩ دەربارەی هەولیر باسی کردوە « شاری هەولیر کونترینی شارە ولە زمانی اشـوریە کانەوە هەتا ئیستا کونە شاری وەکم شارە ماوە لە دەشـتی ئەمشارە دارا

ملـكى فرس شـەر لەگـەل ئەسـكندەر قەومـا سـالى ٣٣٠ پيش ميلاد • شارەكە گرنگترينى شوينى قەلايە » • ديسان لە ديباجەى كتيبەكـە ئەلى ناوى هەولير « اربا/ئيل » يانى جيگاى چوارخوا • وەلە زەمانى بابليەكانيش جيگاى « عەشتار ، لە هەولير بوە ئەو نوسينەى كە سنحاريب ملكى اشورەكان نوسيويەتى « ئەلى من كە ملكى سەر زەمينىا وائشـورم س٣ روبارم هەلكەند • وباسى گەيشتنى انگليز بو هەولير باس ئەكا كاتى لـە شكرى تورك وولاتى كركوكيان بەجى‌هيشت بەرەو سـنورى موصل چون هيچ شتيكيان لە پيش ئەما بگەنە هەولير وپى‌لى‌ئەنى كە لەهەولير توشى گيرو گرفت بون وبويان نەسازا حكمى ئەم شـارە بكـەن بە يارمـەتى خو ولاتيەكانى كەدەستەلاتيان هەبو وريان بوئەمان خوشى كرد •

وستر هاملتون ديسان نوسراويكى بە انگليزى چاپ كردوە كەدوسال لە عراق ماوە وەريگاى هەولير وەرواندوز گردوتەوە ونوسراوەكەى بەريگايك لە كوردستان ناوبراوە وكابتن هاى حاكمى سياسى بەريتانى ناوچەى هەولير كە دوسال لەهەولير كار بەدەست بو پرتوكيكى دور ودريژى نوسيوە وبەشى زورى ئەم نوسراوە هەوالى هەولير لە سالانى ١٩١٩ تا ١٩٢١ ئەكات وئـەم نوسراوەش چاپ‌كراوە ئەم نوسـراوە هەرچەند زور باس ولاتى هـەوليرى تيايە تەنها ليرەدا ناونيشانى ئەم نوسراوان بوخوتيدە واران روشنا كرا لەبەر دورو دريژى ئەم‌باسانە لەتوا نابنە كەليرە بنوسـريتەوە ــ وەدوبـارە ئـەم پرتوكانە چاپ كراوەن خوينـدەوارن ئەگـەر پى ويسـتيان بى ئەتواتن بى بيخوننەوە • بەلام ليردا نوسينى چەند نوسراوكى اوروپى تر ئەنوسينەوە لەبەر ئەوەى نوسراويان بەسانا بەچەنگ ناكەوى •

**٨ ـ مستر لونكريك لە نوسراویدا**

« میژوی چوارچە رخەی نوی عراق » ماموستا جعفر خیاط کردویە بە عربی لە زور جیگا باسی هەولیری کردوە وهاروەها دەربارەی حکمداریەتی محمد پاشای رەواندزی باسی ئەکا لەلاپەرەکانی ١٢٢ــ١٦٩ــ٢١١ــ٦٢٢ لە بابەتە ئەو شەرانەی کە لە ناوچەی هەولیر بەریابوە • ودەری ئەخـــاکەم ئەم شارە لە هەرشەریکدا نە توانراوە بیگری•ودەری ئەمخاکە عوسمانیەکان لەگەل هەموهیزیان زورجار توشی گیروگرفت بوینە وبویان نەکراوە ئەم شارە دەشـــویتانی دەوروپشتی لەکوردســــتاندا بەتەواوی بخەنە ژیـــر حوکمی خویانەوە •

**٩ ـ (( لە نوسراوی )) بکداد ستی اوف پیس**

لە نوسینی ریچرد کوك لەزور جیگایدا ناوی هەولیر هاتوە• لەم نوسراوە دا مغولیەکان زور جار ویستویانە هەولیرو وولاتەکە بگرن سەرنەئەکەوتون• ولەم ناوچەیەدا زور شەر لە بەینی مغولی وەلە شکری اســلامی قەوماوە • وباسیشەری سەرکردەکانی ئەم ناوچەیە ئەکا لەگەل عسمانیەکانا لەنــزیکی شاری هەولیرەوە •

**١٠ ـ ویلوسون لە نوسراوی (( میزو بوتامیا ))**

لە سالی ١٩١٧ تا ١٩٢٠ کە لەمیژوی عراق ئەدوی لەزور جیگـــا باسی هەولیر ئەکـــا دووســـال لەوولاتی هـــەولیر بوە وباسی شـــەری انکلیـــز وعسمانیەکان • وادیـــارە میژوی ئـــەم س٣ ســـال باســـی ئەکا وئەلی لـــە

زەمانی ئنگلیزەکاندا هەولیر کرا بەلیوا وتشکیلاتی اداری تیا دامەزرا پاش سالی ۱۹۱۸ ٠

**نوسینی هەندی لە « رحالەی » ئەوروپی دەربارەی شاری هەولیر ٠**

گەلی لە نوسرە بیگانکان لە کوردستان وە یا لـە عراق پیش ئیستا گەراون وسوڕاون ولە نوسینی ئەمانە ولە نامەیانا کە لە پاش گەرانەوە بو وولاتی خویان نوسیویانە ، گەلیکیان دەربارەی هەولیر باسیان کردوە لە نوسینی ئەم نوسەرەرانە لەم بەشەدا بە شەیەك بوخوینەوارن پیشکەشی ئەکەین ٠

**١١ ـ (( رحالەی )) بریتانی ٠ جاك ستون**

کە لە قرنی هەژدەهەمدا لەگەلی شوینی عراق سوراوە ئەلی « لـە النون کوپریەوە کەتیپەرین گەیشتینە دەشتیك کـە زورجوان سەوز وبەکشتوکال وگەنم زەمینی داپوشراپو ، پاش چەنـد فرسخەیك ( میل ) گەیشتینە هەولیر وادیارە ئەم شارە لەکوندا زور بەناوبانك بوە چونکی بەشی زوری شارەکە لەسەر گردیکی بە رزە لەقەلایەکی سەخت لە لای رۆر ئاوای اربل لە نزیك شار چەند چالیك هەیەوا دیارە چالی نەوتە وە لەنزیك ئەم شارە گەورە ترین شەر لە کوندا روی داوە کە شـەری داراو اسکندەر » دیسان ئەلی « لە اربلە وە گەیشتمە شاریکی بچوك کە (عینکاوا) ناو ئەبری لەوی‌وە روەو بە دی کەلەلك لەگەل کاروان کەوتمە ڕی ٠٠ » ٠

### ١٢ ــ میبرسون له نوسراوی

« بو وولاتی ( بین النهرین وکردســـتان ) دەربارەی هەولیر ئـــەلی اربلا ناوی ئەم شارەیە کە ئیستابە اربیل ناوئەبری » هەولیر لایەکی هـــەوی گردی بچوك وخوی لەوە شتیکا ولە پشتەوە شاخە بە رزکان دیارە « ئەلی » کاتی عەصر ئەبو گەیشتمە ئەم شـــارە روژی لە روژانی بە هاری بە باراندا ، هەورە تریشقە وچخماخە زور بە توندی وبارانیکی زور دای‌دا لـــە کومـــەلە هەوریکی ترســـناکی رەش ، روژیکی زور بە هیبەت بو کە خلیقەتی خوا بە بیری ئینسان دینی • ئەوەش شـــاناپە بـــە هەولیر چونکی ئـــەم شـــارە لە کوندا بەناوی شاری خوای عەشتار اربل ناوبراوە • وا دەرئەکەوی زور ئاثاری اشوری لەژیر قەلادا هەیی • وەختی خوی معبدی هـــەولیر نزیکەی هەزار سالە جی‌عبادەی هەمو وەیا زور لەمیلەتان بوە • هەولیر لەکردســـتانی خواروە وخەلکی شارەکە زبانیان کردە لهجەی موکری ئەدوین ، ئەم شـــارە لە زور زەماندا وتایبەتی لە زەمانی هەندی لە شاهانی اشـــوری پایتەخت‌بوە وزور وەختیش پایتەختی ئاینی‌بوە و ناوی شاربە ارباثلو ناوبراوە واتە شاری چوارخوا ئەم شارە پیش س۳هەزار ســـالیش هەربوە لـــە وەختی حکمی مادیەکان واشـــوریەکان وفرث وروماں وعرب ئەم شـــارە هەروە کوئیستای دروست‌بوە وبگرە زیادیش بووە •

ملک، اشوریەکان زور بروایان بە هەولیر بوە وبە شـــوینگای حەج ناسراو ملکی اشوری بەناوبانك سنحاریب سالی ٦٩٢ پیش میلاد هاتویتـــە حەجی‌کردوە کەخوا موفقی بکات لە شەرەکانیا • لەپـــاش اشـــوری هەولیر لەژیر حکمی مادەکاندابوە • هەروەها لەوەختی زور لەحاکم وشـــاکان بـــە

شوینکه پیروز وناوبانکی‌بوه •• زور سه‌راوده‌راو هاتویته سه‌ر ئه‌م شــاره له‌به‌ر ئه‌وه گه‌لی کونه شوینی‌وه جیگه‌ی عباده‌ت گاهی عه‌شتار وزور شوینی تاریخی تر که ئیستا که‌وتوه‌ته ژیرخاك •• » •

## ۱۲ ــ رۆژهه‌لات ناس هولندی ( مالیبارد ) ناو

ده‌رباره‌ی شاری هه‌ولیر له نوسراوی خوی باسی ئه‌کا وئه‌لی « ئــه‌و شاره کونانه‌ی که له سه‌ر زه‌مینی بوینه هه‌مو ویران‌بون ته‌نها شاری هه‌ولیر یه‌کیکه له‌و شارانه که له‌گه‌ل چه‌رخه‌ی فه‌لك سوراوه وئه‌م شاره مه‌زنــه به‌رامبه‌ر هه‌مو کاره‌سات وفه‌لاکه‌ت به‌رانگیر بوه وه راوه‌ستاوه • بــه‌لای که‌مه‌وه ئه‌توانین بلینــ(٥)چه‌رخی زه‌مانه‌ی‌دیوه وله(ته‌ورات) به اربائیلا ناوی هاتوه • ئه‌م شاره پیروزه که به‌دیمه‌نی شوره‌کان وقه‌لایا شانازو ســه‌ر به‌رزه وه‌ك شیریکی پولا له‌سه‌ر بناغه‌ی عه‌رد وروست بوه که به رزای له سی ۳۰ م پتر • وچوارده‌وری ده‌شت وهه‌ردیکی به‌ریل وگه‌وره‌یه •

له شوینکی سه‌خت وزور قه‌لا له سه‌ر گرده‌کان که زور له میژو نوسان ئه‌لین ئه‌و گردو ته‌پولکانه‌ی ده‌وروپشتی له‌وه‌ختی خویدا سه‌نگه‌ری شــه‌ر بوه بوپاریز گاری هه‌مو په‌لاماریکی بیگانه » •

«ئیمه نازانین ونه‌مان دیوه هیچ شاریك وه‌یاشاخیك به‌رامبه‌ر به ده‌ورانه‌ی فه‌له‌ك ٥٠ چه‌رخ‌مابی وه‌ك شاری هه‌ولیر به‌و سه‌ربه‌رزیه‌وه له‌جی‌ی خوی بلند وئه‌م چــه‌ند زه‌مــانه وه‌کو بلی تــازه دروست کراوه • ئیستا ئه‌بینی کــه دیواره‌کانی چه‌ند گه‌ز پانه‌و درگاکانی زور تاریك ئه‌لی ئه‌م شــاره هیــچ نه‌گوراوه وهیچی به سه‌ر نه‌هاتوه • له‌گه‌ل ئه‌مه‌شدا شاری هه‌ولیر تازه کــه

بەخوارقەلاوە دروست بوە لە سەر نەخشە ، تازە ئەویش یەکێکی بیگانە سەر لەرێگاو شوێنی دەرناکا •

ئەم شارە میژوی‌یە لە پیش اشوریەکان مەبلەندی ئاینی ودیانەت بووە هەرچەندە شارە اشوریەکان ئیستا خاکیشیان نەماوە وەك نەنیواو نمرود کەچی هەولیر کە زور لەمان کوتترە لە شوێنی خویدایە « وادیارە شورا سەختەکانی ئەم شارە چاوی هەمو پالاماردەرێکی شکاندوە وری نەداوە نزیك کەوتەوە ، ئەوانەی کەلەنقشە وشتی‌کون باس ئەکەن وەیا خاك ئەکولنەوە بوزانینی میژوی کون زور شتی نایابیان بەدەست هیناوە لە دەوراوپشتی ئەم شارە ، هەندی لەم شتانە ئەتوانین بلین کونەمیژوی ئەگەرێتەوە بو پەیدا بونی ئادەمی لەسەر رووی زەوی •

چەند بیرێکی قولی تیدایە لەکونەوە ماوەتەوە وشك نەبوە وئاوی لی نەبراوە صلاح الدین ئەوقارەمانەی کەشەری‌لەــ صلیبیەکان ، کردوە لەم‌شارە گەورەبوە وچەندین قارمانی‌تر لەم شارەدا لە میژودا هەرکاتی‌توانیویان پەلاماری هەرشوێنیکی سەختە بدەن وبینجەنە دەست ، بتوانن شارو ولاتی خویشیان لەهەمو هیرشیکی بیگانە بپاریزن • مەغول بەهەمو هیزو جەربەزەیانەوە نەیان توانی ئەم شارەیە خسیر بکەن هەرچەند زور لەشارو وولاتانی تریان داگیر کرد وزوریان ویران کردوە ئەم شارە هەتا ئیستا لەسەر پایتەختی کولکەی کردەگەی دانیشتوە ودانیشتوانی هەرکاتی بی‌ترس لەهەزارەها پشتەوە هەتا ئەمرو •• » •

لەنوسینی ئەم روژهەلات ناسە أوروپیە دەرئەکەوی کە شاری هەولیر وولاتی ئاوەدارانی میژدوزور ، قارەمانی پی گەیاندوە ــ میژوی هیندە کونە

زور نازانن وچەند کەسـیك لەو قارەمانانەی کەشایانی شانازای بون لەهەردەمیکدا ناوئەبەین وەك « خلیفـه صلاح‌الدین ایوبی ، وشـای کورد مظفرالدین ، ونیری کوردستان محمدپاشای رەواندوزی وزور کەسانی‌تر »٠

## ١٤ ـ ( نیبور ) دانماركی كه أصلا المانیه

له چەرخی هەژدەهەمی پاش میلاد کوردستان گەراوە لەبابەت هەولیرەوە نوسیویە « ئەمشارە اربل کەلەکونەدا بە اربیلا ناوی هاتوە وشەریکی داروە اسکندر لە نزیکیەوە بەرپابوە ٠ لەم ولاتە زور حکمـداریەتی بچوك پیك هاتوە لەدەوری اسلامیدا یەکی لەشاکانی دەستەلاتی بەسەردابوە تا ئەگاتـە تەوریز ٠ وادیارە ئەمشارە زور گەورە بوە بەلام ئیستا بیجگە قەلاکەوە هیچی نری نەمـاوە ئـەم قەلایـە چواردەوری زورسـەخت وقایمـە قەلا لـە سەر گردیکی گەورە دروست بوە وشاری هەولیر کون لە دەوراوپشتی بوە ئیستا چەند مالیکی کەم لە دەوری قەلا بـلاو بوەتـەوە ٠ لە نـاو زەوی کشتوکالدا نیشانەی اساری کون وروخاوە ومزگەوتەکەی تائیستا ماوە وئەم مزگەوت ومنارەیە لە دەوری مظفرالدین دروست بووە ٠ کشتوکالی هەولیر ئاوی زی وچاوگە ئاخواتەوە وخەلکی زور گەنم ئەچینی ئەمەش لەسەرباراناو بون ونەبونی ئەوەستی ٠٠» ٠

## ١٥ ـ جیمس باكنك هام كه له عراق له سال ١٨٣٦

هەلسوراوە دەربارەی شاری هەولیر ئەلی لە التون‌کوپریە پاش دە فرسخ گەیشتینە اربل ئەم شـارە لەناو دەشتیکی مەزنا کە کشتوکالیکی زوری لی

ئەکری ، ئەم شارە بە شوینکی سەخت بە رامبەر بە دوژمن پاشاکانی بغداد حسابی ئەکەن • قەلایەکی تیدایە ، زور شـتی لی دروسـت ئەکـری وەك بـەرگی‌کەتان وەلوکە لەدەشتەکەیا روباریکی گەورە تی‌ئەپەری ، هەندی لەخەلکی ئەم شارە کوچەرن لەشوینی بوشوینی ئامەشو ئەکەن •

لە شوینکی‌تر لە باسی کـەیا ئەلی « هەولیر دوهـەم شـارە لەسەروی عراق پاشی موصل ، دانیشتوانی شارەکە ژمارەیان لە دەهەزار زیاترە • دوو مزگەوتی مەزنی تیدایە لە گەل بازاریکی گەورە وچەند جادەیەك ، خەلـکی شارەکە لەجلوبەرگا پوشتەن وچەندین بنای ریکوپیکی تیدایە •

قەلاکەی هەولیر زور ئەشبهیتە قەلای حلب بەلام لەقلای حلب گەورەترە وادیارە ئەوقەلایە وەختی خوی دەست ریژە • بەشیك لەخەلکی شـار لەناو قەلا دائەژین‌وبەشی‌کەی لە خوار قەلا •

هەمو جغرافیـەکان پی‌لی ئەلین اربیـل ئیستا هەر لە شـوین خویەتی کەوەختی بە اربلا ناوئەبرا •

لە دیباجەی کتیبەکەیدا لە شونیبك ئەلی ، لە نزیك هەولیر دوو پارچە شـتی کون دوزراوەتـەوە کـە وەك گویـزیك ورەنك ریشـەی وەك شوشەبوە •

**١٦ ـ مستر زبیج کە لە سالی ١٩٢٠**

کە کوردستانا گەراوە لە بابەت هەولیرەوە هەندی شتی ووتوە وزور جار ناوی هیناوە لیرە چەند شتیك لە باسەکەی وەرئەگرین کەدەستی پی‌ئەکا

له سەفەرەکەما گەیشمنە هەلەجە وەبستانە لەوی‌وە دی قوشپتە کە هی عشیرەتی دزی‌یەوە کە نزیکی هەولیر بومەوە دیمەنی شارەکەم بەم چەشنە دی «قەلا بەرزەکەی لە پشتوە شاخی بەرز بەرەنگیکی جوان ودیمەنیکی رەنگین دەرئەکەوی • لە نزیکی شار لای کاریزی حاجی قاسم اغا خیتوەتمان هەلدا•

پاشی روژی کە داخلی شار بوم چوینە سەیری منارە کونەکە کە وەك خوی‌ماوە بەرزی ئەم منارەیە ١٢١ پی‌یە وپانی ٢١ پی‌یە بەلام مزگەوتەکە روخاوە وزور خانوی ویرانە لەدەوریشتنی •

خەلك وشورای شار هەرچەند خراپ بوە بە لام نیشانەی بەتەواوی ئەبنیری •

لەباسەکەیدا ئەلی « گەلیك لەخەلکی هەولیر دەوریان دام ولە قسەیان نەگەیشتم بەلام هیچیکی وانزیکم نەکەوتن کەپیم ناخوش‌بی منیش بەرویەکی خوشەوە لی‌یان ورد ئەبومەوە لەم شارەدا غەریب بوم بەلام خوم بەئەمین دەزانی بەبی نوبەچی وەپاسەوان • سەیری قەلای هەولیرم کرد کەسەدو پەنجا پی‌ی لەخاکەوە بەرزە وپانی نزیکی چوار سەد یاردە ومن وا تی گەم کە قەلا لە زەمانی کوندا لە مەش بەرزتر بوە • ولە خەلك زانیم کە لە ژیر قەلا چەند ژیر زەمینی تیدایە •

لە دەشتی هەولیر کەرویشك وپامز بەزوری پەیدا ئەبی هەروەها راوکەران بە باز راو ئەکەن وئەنیرن بو شوینەکانی کەی کوردستان•

## ١٧ ـ نوسەری انگلیزی مستر جیمس ویلی فریزر

کە لە کوردستانا گەراوە لە سالی ١٨٣٤ لە زور شوینی باسی هەولیر ئەکا ولە نوسینەکەی دەر ئەکەوی لە کاتیکا میرانی سوران حکمداری کوردستان هاتوەتە کوردستان • وباسی تبیعەتی خەلکی هەولیر ئەکا ئەلی ئەماتە زوو تورە ئەبن وکوردەواری ئەم ناوچەیە خودخا فیری شەرن ولەلانکە وە دەست بەفیربونی شەرئەکەن وهیچ تاسودەیان نایەت ئەگەر شەرنەکەن ومن زور گەنجم دی کە دوازدە وپازدە سالیش تەمەنیان کەمتربو بریندار بون چونکە لە چەند شەریکدا بەشدار بوبون شەر ئەکەن بەتفەنك وبە چەپوکی دەست دانە خەنجەر ئەم کارەیان بەراستەقینەیە • ئەلی « ئەم شارە تورکەکان هیچ کاتی نەیان توانیوە بیگرن • چونکی شاخەکانی ئەم وولاتە زور سەختە وخوی بەتەبیعی خەتیکی پاریزیە بەرامبەر بەهەمو بیگانەیك کەبیەوی ئەم وولاتە داگیربکا • لەم وولاتە دزیوجەردەنیە بوخوت شەو دەرگا والا کە ومەترسی • چونکی حکمدارانی کوردی ئەم وولاتە پیشی خراپەیان گرتوە •• » •

زور نوسەری تر دەربارەی ئەم شاریان نوسیوە ئەم نوسەرانە گەلیکیان ئەوروپاین ئیمە لەم نوسراوە نوسینی چەند کەس لە مانە و چەند نوسەری میژوی ئیسلام کەچیان دەربارەی هەولیر نوسوەتەوە ئەم زانستانە پاش ئەوەی لە عەربیەوە کردومانە کوردی لیرەدا بو خویندوارن پیش کەشی ئەکەین •

وپاش ئەم بەندە لەچەند بەندی تر باس چەند نوسەری بەناو بانگی عیراق کە بەعربی هەریکە شتیکی دەربارەی ئەمشارە نوسیتەوە •

**باسی هەولیر لە نوسراوە عربیەکانا**

بوتان ئەگرینەوە گەلی‌لە نوسەرانی میژوی عرب وەیادەرباوەی شارەکان کەنوسیویانە وەیالە نامەکانی جغرافیا ناوی‌و باسی هەولیر هـاتوە • هەرچی پیمان کرا لەو نوسراوانە لیرە بە کورتی لە پاشی گورینی لیرەدا لی‌ی دواوین•

تەبیعی زور نوسەری تریش هەیە لەم بابەتەوە هەلکولینکی تەواوی هەیە ولەم بەشەدا باسی نەکراوە چونکی لە تواناى خومان هەرچیمـان بەرچـاو کەوتبی تەنا لەم نوسینەدا نوسراوە، ئینجا یەك دوای یەك لیرەدا هەرچی لەو نوسراوانە هاتبی باسی ئەکەین •

**١٨ ـ ماموستا عبدالرزاق الحسنی**

لە نوسراوی « تاریخ البلدان العراقیه » باسی هەولیر ئەکا کە ئەلی لـە زور سەرچاوە وکتیب ونوسراوی تر وەری گرتوە • دەربارەی میژوی کونی هەولیر ئەلی « ئەم شارە بە اربل ناوبراوە وبە اربائیلوش ناوی هاتوە و لـە اساری میژوی اشوری ناوی‌هاتوە کە شاریکی پیروز وجیگای خوا عەشـتار بوە » « ئەم شارە لە زور شارە کونەکانی تر گرنك تر بوە وریگای کاروانی نیوان وولات ودەولەتان بوە • وسەرە ریگـای بازرگان‌وگەشـت کـەران ( رحالە ) بوە » •

ئەم شارە لە گەل چەرخی زەمانە زور شەری دیوە وەك شـەری تەتەر وشەری دارا واسکندر وکاتی‌حاکمیەتی مظفرالدین لە کوردستانا تەتەرەکان نەیان توانیوە هەولیر بگرن ، لەم نوسراوە ولیر بە شاری هەولیر کون وتازە

ماموستا عبدالرزاق باسی کردوه ئیمه لیرەدا تەنها ئـەوەی باسی میژوویە ئەنیوسینەوە •

ماموستا ئەلی خەلکی هەولیر کوردن ولەسـەر رەوشـت وزیـانی کونی کورد ماون وله نزیکی ئەم شارە نزیکەی سی صەدو پەنجا کاریزە بوه وگەلی علمان گەورەی اسلام له اصلا خەلکی ئەم شـارەن وەك ابو البرکات کەناسراوە بە ابن المستوفی وعالم علی عیسی اربیلی وابو احمد القاسم الاربلی منارەیەکی کون له هەولیر ماوەتەوە ئەممنارەیە ئیرانیەکان دروسـتیان کردوه « ماموستای بەریز لیمان یبوری ئەم منارەیە له هەموکتیبی میژوو نوسـراوە کە حاکمی هەولیر مظفرالدین دروست کردوه » •

## ١٩ ــ ماموستایان طه باقر وفؤاد سفر

له بەرگی(ە) نوسراوایان «بو وولاتە پیش کەوتوەکانی کون» ئەلین اربل ناوی زور جار له نوسراوە کونەکانی میژودا هاتوه وئەتوانین بلین ئەم شـارە تەنها شاریکە له زمانی اشوریان تا ئیستا ماوە وناوی له میژوی سومەریەکان کە دوو هەزار سال بیش عیسایە بە « اوربیلیم » ناوبراوە ولـە نوسـراوی بابلیەکانا بە «اربائیلو» ناوی هاتوە ئەم شارە له دەوری زور کون (کعبەیەك بوه بە پەرستکا وشوینی عەشتار ) ناسراوە •

لەقەلای هەولیر چەند نوسراوی کون دوزراوە تەوە لە گەل پەیکەریك « تمثال » لەمیسی زەرد دروست کراوە ولە سەری نوسراوی « ئەشتار» •

سنحاریب ملیکی اشوری له نزیك هەولیر جوگایەکی ئـاوی گەورەی هەلبەستوه له بەستورەوە وبوهەولیر ئاوی کواستوەتەوە •

ناوی هەولیر لە شەری دارا واسکندردا هاتوە لە لە سالی ٣٣١ پیش‌عیسی رویداوە ، هەولیر لە زەمانی فورثی سالی ١٤٨ پیش عیسی هەتا سالی ٢٢٦ پاشی پاینەختی دەولەتیکی مەزنەبوە کە ( حدیباب ) ناوبراوە ئەو دەولەتـە مەزنە زور بەهیز بوە وچەندین وولاتی‌دی‌خستوەتە ژیـــر چنك بیجگـــە وولاتی هەولیر دەســـتی بەســـەر هـــەمو مـــابەین هـــەولیر ونصیبی . وسنوریکی تری روباری فرات‌بوە وشەی «حدیاب» لەزمانی ئارامی ئەوتری بە مابەین هەر دوو زی .

شاری هەولیر بەینیکی زور سلوقیەکان وفرثی هەردوولا هـــەولیان‌داوە داگیری بکـــەن لەگەل ئەمەدا کوردی ئەم وولاتە ســـەریان بو هیچ لایـــەك دانەناوە .

ئەرمەنەکان لە زەمانی پاشایان « تکرانی‌یە کەم » سالی ٨٣ پیش عیسی ویستویانە هەولیر بگرن بویان نەکراوە .

شاری هەولیر زور شەرو فەرتەنەی تری دیوە رومانیەکان ویستویانە کە حکمی بکەن بەلام قیصری رومانی ــ هدریان ــ ناو وازی لـــەم وولاتە هیناوە وپاشی بەینیك امبراتوری رومانی‌ــ کرکلا‌ــ پە لاماری خاکی هەولیری داوە ئەمیش هیچی پی نەکراوە لەبەر ئەوە دەستی کرد بە هەلکەندنی گوری مردوەکان کە لەدەروەی شاربوە .

لە سالی ٥٠٠ میلادی دیانەتی مسیحی بلاوبوەتەوە وبوەتە ناوچە یەکی دینی بوبرایانی عیسای قەشـــەزیخا یەکەم کەسیکە کەنوسراویکی بە زمـــانی سریانی لە میژوی هەولیر نوســـیویەتە ئەم نواســـرە لە چەرخی شەش پاشی عیسی‌بوە لـــەدەوری اســـــلامدا شـــــاری هەولـــیر لـــەدەوری قـــــەلا شوراو چەند خەندەق وبازاریکی مەزنو چەندین مزگەوتی تیاکراوە .

ناوی کونی هەولیر اربئیلو واربل بوه وبه زمـانی کوردی له کوندا به ناوبراوه ئـەم وشـەیه ورده ورده بوه بـه ( ئەوەلیره ) ئـەم وشـەیەش گوراوه به ( هەولیره ) « ئیستا به کوردی به هەولیر ناو ئەبری » •
منارەی کونی هەولیر تـا ئیستا ماوه لەلایەن شـا مظفرالدین دروست کراوه •

له بابـەت ئاساری ( شوینەوار ) وولاتی هەولیر له چیـای حریر زور بەجی ماوەی کون هەروەهـا نـاوی ئەشـکەوتی « شـانەدەر » ئەبـەن وئەو ئەشکەوته چەند سال لەمەوپیشن زور شتی تیا دوزرایتەوه • ئەشکەوتی شـانەدەر دەرگای پانی ٨٢ پی‌یه وبالای ٢٦ پی‌یه وله ناوەوه پانی ١٧٥ پی‌یه وقولی ئیسـتـا نزیکی ١٧٥ پی‌یه وزیاتر ولـەم ئەشـکەوته ریگاهـەیه بو ئەشـکەوتیکی تر تا ئیسـتا ( دایرەی ئاسـار ) وهیچ کەس نەچوەته ناو ئەشکەوتی دوهەم •

ئەم پشکنینه لەئەشکەوتی ناو براو دەری ئەخا که خـەلك لەو خـاکه پیش دەوری میژو کـه « دەوری بەرد ناوئەبری » ژیاوه وا دیاره ئـەم ئەشکەوته هەفتا هەزار سال پیش‌تربوه ( ئاساری مروڤی کونی سـیتری له) ئەشکەوته دوزراوەتەوه وزور شتی عەنتیکه که بەدەست کاری دروست کراوه پاشی هەلکەندن وگەران ودەست هاتوه ودوزرایتەوه •

لەم نوسراوه وادەر ئەکەوی که خاکی عیراق کونترین خاکه له سـەر رووی زەمین که مروڤی تیا پەیدا بوه وئەو شتانه کەدوزرا تیەوه دیاری ئەخا خەلکی ئەم خاکه له میژودا هەرپیش کەوتوبون ودیسان لەم‌میژووه روناکەخا دەرئەکەوی که وولاتی‌کورد هەر ئاوەدان بوه •

### ٢٠ ـ له «دائرة المعارف العراقية» بەرگی یەکەم

دەربارەی هەولیر «شاریکە شایەتی میژویەکی زور کون وبە اربیل واربیلا ناو براوە وزور جار لە کتیب نوسراوە لەگەل شەری اسکندر ودارا ناوی هاتوە.هەولیر لە سالی ٦٠٠هـ ناوبانگی بلاوبوتەوە «وا تی‌ئەگەم» کە مقصد ئەوەیە وەختی حکمی مظفرالدین . لەوزەمانە داشاری هەولیر زور گەورە بوە وهەتا لە دەوری مغولیکان شار وولاتی هەولیر چنك مغول نەکەوتوە ولەلایەن میرەکوردەکانەوە حکم کراوە . هەروەها ئەم شارە لە دەوری عثمانیەکانیشا والیەکان لەسەر ئەم وولاتە دەستەلاتیکی تەواویان نەبوە هەولیر دانیشتویان ریان نەداوە بەنادرشا لە ١٧٣٢م داگیری بکا وبی‌بخاتە خاکیەوە .

هەولیر لەنەخشە کونەکانی بابلی وئاشوریەکان بەنوسینی بزماری بە أربا أیلو ناوبراوە ولەنەخشە کونەکانی ایرانیان بە اربیلا ناوی هاتوە .

ئەم شارە لە میژوی کوندا جیگای کعبە (ئەشتەر) بوە کەلە هەمو لایەکەوە خەلکی بوهاتوە لە چەرخەی دووهەمی پیشت عیسی لە ناوچەی هەولیر دەولەتیکی سەربەخو بەناوی ئەشکانیان «وادیارە ئەمانە تایفەیەك بونین لەکوردەواری دەوروپشتی وولاتی‌هەولیر وئەشکانیەکان نەیان هیشتوە بی‌گاتە دەست بخانە کاروباری وولاتیانەوە بەم مەبەستەوە ساسانیەکان کەزور وولاتیان بەدەست هیناوە . نەیان توانیوە وولاتی هەولیر ، داگیر بکەن لە حکمیدارانی کونی سالی ٣٥٨ م کەشوورەتی قورداغ بوە شوینی‌قەلا مەرکزی دەولەت بوە ولە زەمانی ئەم تا کوردە ئاینی مسیحی

سلمانډوه وپه سند بوه هەولیر سال ٥٦٣ هـ دەولەتیکی کوردی تیا بوه کـه لەلایەن زین‌الدین علی کچکەوە دامەزراوه وپایتەختی شازەهی‌دایه بوه٠لەناو دارانی ئەم بنه مالیه سلطان منظفرالدین کـەزاوای قـارەمان سـلطان صلاح‌الدین بوه ٠

لەبابەت شوینه کونەکانی هەولیر ، منارەیەکی زور کون وقەلایەکی کونتر، وادیاره ئەم قەلایه زورسەخت بوه بەرامبەر هەمو به لامارداینك دوودەرگای بوه هەرکات ئەم دەرگانه داخراوه کەسه نەی ئەتوانی بگاته نزیکی ٠

**٢١ ـ ماموستایان (( محمد هادي دفتر وعبدالله حسن ))**

لە نوسراویان «عراقی‌سەرو دایر به هەولیر ئەلین » ئەم لیوایه له میژوی کونداا زور باس‌کراوه وله خـاکی ئەم ناوچە شەری فارسـەکان ومادیەکان « کوردەکان » چەند جار روی‌داوه وهەروەها له نزیك ئەم شاره شەری دارا واسکندر به هەمو هیزو بەرپـابوه وزور شـەرو ئاشـوبی تـر له مابین هولاکو وتیمور لنك واسلامەکارندا ٠ وولاتی هەولیر بـه نـاوی شـاره گەورەکەی هەولیر ( اربیل ) نـاو ئەبری وئەلین ناوی کونی « اربائیل بوه » لەم شارەدا قەلایەکی زور کون هەیه وکەس نازانی ئەم شـاره چـەوەختی دروست کراوه وبنیانی کی‌یه زور میژو نوسان ئەلین ئەم شـاره له نینوی‌و بابل کونتره » ٠

**٢٢ ـ له نوسراوی (( دليل الجغرافي العراقي )) نوسینی دکتور احمد سوسة**

لاپەره ٣٧ دەربارەی شـاری هەولیر هاتوه « له شـارانی به ناوبانگی عراقه وله کونەوه هەتا ئیستا هەر لەوجوده پی‌ی ئەوترا بـه نوسـینی بابلی

واشوری به ( اربائیلو ) وبه نوسینی فارسی‌کون به ( اربیره ) نـاو ئه‌برا ئه‌م شوینی ــ شاری هه‌ولیر ته‌نها شاریکه له کونترین شاره‌کان که هه‌تا ئیستا به‌دروستی ماوه‌ته‌وه وئه‌م شـاره له‌زه‌مانی کون زور به شاریکی به ناوبانك ئه‌ژمیرا چونکی له ناوچه‌ی چه‌ند ریگا کاروانی هه‌لـکه‌وتون له‌بـه‌ر ئه‌مـه بازرگانی وتجارتی هه‌مو لایه‌ك له‌م شاره‌وه تی‌ئه‌په‌ری ودووباره ئه‌م شـاره به شاریکی به نرخ ئه‌ژمیرا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی چه‌ند جیگای ئاینی وعباده‌تی کونی تیابو » •

هه‌لکه‌وتنی شـــاره‌که لــه ناوچـه‌ی وولاتیکی کـــه‌وره‌دا بو زور شه‌ری مه‌زن وگه‌رم له ئه‌م شـــاره له میژوی کون روی داوه ولـه‌م شـه‌ره به‌ناو بانگانه شه‌ری اسکندری گه‌وره‌و وداری پاشای فارس لــه ســالی ۳۹۱پیش عیسی • شاری هه‌ولیر هه‌ر له‌کونه‌وه به دوو به‌شی هه‌لـکه‌وتوه بــه شیکیان له‌سه‌ر قه‌لابوه که ئه‌وقه‌لایه‌ش وه‌ختی خوی له ســه‌ر گردیکی به رزو به‌رینی دروست کراوه وپارچه‌ی دووهه‌می شـاره‌که له خواره‌وه بوه واتـــه‌ده‌وراوپشـــتی قـه‌لا خـانو وبـازار ومزگـــه‌وت لـه قـه‌لاوه بودامینی قـــه‌لا ولـه خواره‌وه‌ی قـــه‌لاکونه‌ی هـــه‌ولیر ۳۵ م لـــه خواره‌وه بـه‌رزی ولـه ژیـره‌وه بو قـه‌لا لـه کونـدا دوو راوری بـوه بو سه‌رکه‌وتن وله ده‌رگای الای هه‌ر ریگایه‌کیان چوه‌ته نیو قه‌لا • له ســه‌ر ده‌رگای گه‌وره شوینیکی به‌رز فیداکراوه وه‌ك برجیکی به‌رز ئه‌مه شی بو ته ماشای ئه‌و لاو ئه‌ولای قه‌لات بوه له‌کاتی شه‌رو ته‌نگان دا • زور جار ئـه‌م برجه به کار هاتوه هه‌ر وه‌ختی ده‌وراوپشتی شاره‌که له‌ترف دوژمنه‌وه گیرابی هه‌ولیر هه‌شتاو نو کیلومتر له کرکوك دوره وه‌له هه‌ولیر بو شـاری موصـل نه‌ود وپینج کیلومتره •

مام وستای بەریز هەروەها لە نوسراوەکەی ئەلی هاوینە هەوارەکـانی ولاتی هەولیر حاجی هومران وشـقلاوە ـ وصـلاح الدین ـ ولـەم رومەوە وزورشتی تر باس ئەکا .

وئەلی لەشوینە کونەکانی هەولیر کە بەهەواری کون ئەژمیری «جوگەی سنحاریب» شوین ئاواری لای گوندی مورتکەیە وەلەویوە (٢٠) کیلومتر جوگەلەیك خراوە تا گەیشتوتە هەولیر .

ولە سەرو چاوەی ئەی لەشوینی هەلگرتنی ئاو نقشە یەکی مـسـماری هەیە کە ئەم باسە روون ئەکاتەوە ولەبەجی ماوەی زورکون (اثـار) کـە ئەگرنەوە چەرخی بەرد (پیش میژو) ئەمەش ئەشـکەوتی شانەدەرە زور نوسەری عەربی وەنوسرانی تر دەربارەی میژوی هەولیر باریان کردوە بەلام زوریان تەنها باس چەند دوریە ویا چەرخیك یان کردوە وزوریان باسـیان لەو کاتە کردوە کە هاتوینە هەولیر ئەو هەولیر لەکاتی ژیانی خویـان چلون بووە . لەبەرئەوە زانیت هەرچەند زورە دەباری هەولیر بەلام بچر بچرە هەر نوسەریك باسەکەی و هەندە شتە وبو کاتیکە .

٢٣ ـ مەم وەسـتای

گەورە خوای لی خوش بو (سید حسین حزنی موکریانی) وائەزانم تەنها نوسەریك کوردە کە بەزبانی کوردی گەلی زانستی دەربارەی میـژو و کومەلایتی شار وولاتی هەولیری پیش سالی ١٩٥٠ نوسیوە لەم نوسراوانەی (ئاوریك بو پاشەوە) ولە کاتی خوی لەهەولیر چاپ کراوە لەم پرتوکە باس شاری هەولیر وقەلای ئەکات ولەم نوسراوەی باس حکمدارانی هەولیر ئەکات

وەك میر علی کچکە ــ ومیر زین الدین ــ وشاهی گەورەی هەولیر سـلطان مظفر الدین ــ دربارەی کاتی حکمداری سلطانی ناوبراو گەلی باس پیش کەوتنی هەولیر وباس ئەم دەست گاهانەی وەك قوتابیخانە نەخوش خانە ــ میوانخانە ــ دیوەخانە وزور کردوەی تری ئەم سلطانە ئەکات •

ودەربارەی حکمدارانی سوران کەجار بەجار پایەتەختیان رواندوز بووە وە یا حریر وجارواش بوە هەولیر پایەتەختی دوهەم بووە •

ومام وستای بەریز سید حزنی زور نوسـراوی تـری چـاپ کراوە لەبابت ژیان ومیژوی کورد وبەکەم کەسەکەچاپخـانەی ( زاری کرمـانجی ) لەهەولیر دامەزراندوە وەروژنامە وەگوڤاری کوردی لەهەولیر دەرکردوە•

هەروك باس کرا نوسەری تر ونوسراوی تر زورن کە لە میژوی ئەم ولاتە دواون ئیمەلەمە زیاتر بە پیوست مان نە دی دریژە بەم وتارە بدری •

* * *

# نوسەر

نوسەر هادی رشید چاوشلی لە بنە مالیکی کونی کوردی هەولیرە باپیرە گەورەی بە صالح سور ناو دراووە وە تیرەی ئەم بنە مالە لە کاتی دولەتی عثمانلی بە چاوشلی ناو بانگیان دراوە .

وە لەسالی ١٩٢٠ لە هەولیر بووە وەلە سالی ١٩٤٣م لە کلیەی یاسای (حقوق) دەرچووە ولە سالی ١٩٤٤ کلیەی عسکری تەواو کردوە ــ یکەم کاری لە دولت چەندمانگ بە ملازم ماوە انجا لە مایس ١٩٤٥ بویتە مدیری بازیان (لە ألادی سلیمانی بە مدیرە سور ناو بانگی بلابویتەوە) .

وەلەزور جیگای سلیمانی وهەولیر وەکرکوك فەرمانی دەولتی بە مدیری وقائمقامی وەسەروك بلدیە شارستانی دیوە ــ دوا وەظیفەی (وەکالتی وزیری ناوخوی بووە لەبغدا) .

وچەند سال بە پاریزگای کاری کردوە ئیستە بە کشتوکال لە هەولیر خەریکە .

وەلەزور کومەلی زانستی کاری کردوە وماوەیکی زور لە چەند کوڤار وروژنامە بەکوردی وعربی نوسینی بەردوام بووە وەماوەی چوارسال سەروکی دەستەنوسەرانی گوڤاری وزارتی ناوخو بووە لەکاتیخوی تا ئیستە ٢٥ نوسراوی لە چاپ دراوە .

## رستەی بەشەکانی نوسراو



* * *